# تیرۆریزم وەك تاوانێكی رێكخراو

**مایكل لیمەن و گاری پوتەر**

وەرگێڕانی

ئەبوبەكر مەجیدی

كوردستان — هەولێر

٢٠٠٦



**ناوی كتێب: تیرۆریزم وەك تاوانێكی رێكخراو**

- نووسینی: مایكل لیمەن و گاری پوتەر
- وەرگێڕانی: ئەبوبەكر مەجیدی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٢٣٥
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەكەم: ٢٠٠٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**بنكەی توێژینەوە**

**زنجیرەی كتێب – ١ –**

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی**

**پۆستی ئەلكترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن : 2260311**

www.mukiryani.com

## ناوەڕۆك


پێناسەی تیرۆریزم ........ ٩
تیرۆریستەکان چ جۆرە کەسانێکن ........ ١٢
جۆرەکانی تیرۆریزم ........ ١٥
گوتەزاکانی تیرۆریزم ........ ١٩
گۆڕانکارییە نوێیەکانی تیرۆریزم ........ ٢٠
کەڵك وەرگرتن لە چەکە کیمیاوی و میکرۆبییەکان ........ ٢٢
تیرۆریزمی زانیاری ........ ٢٤
تیرۆریزمی نێودەوڵەتی ........ ٢٧
تیرۆریستەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا ........ ٣١
نیشتمان و ئازادی باسك ........ ٣٢
تیرۆریستەکانی ئەمەریکای لاتین ........ ٣٤
ئەفسانەی گۆتیزمەن ........ ٣٨
تاوانە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان ........ ٤٠
تیرۆریزمی دەوڵەتی و سیاسەتی دەرەوەی ویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ........ ٤٣
گوتیمالا ........ ٤٤
کوبا ........ ٤٥
شیلی ........ ٤٨
ئۆپراسیۆنی کۆندۆر ........ ٤٩
بەشداری ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەمەریکا لە تاوانە ڕێکخراوەکاندا ........ ٤٩
ئۆ. ئێس. ئێس لە ئیتالیاو مارسی ........ ٥٠
سی ئای ئەی لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ........ ٥٣
سی ئای ئەی لە باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا ........ ٥٦
سی ئای ئەی و خاوێنکردنەوەی پارە و پول لە فلۆریدا و حەوزی کارانیب ........ ٥٦
بانکی نیوگان — هەند ........ ٥٧
بانکی نێودەوڵەتیی متمانە و بازرگانی ........ ٥٨
گروپە چالاکەکانی کوبا لە بواری تاوانە ڕێکخراوەکان ........ ٦٠





ڕووداوی ئێران — کۆنترا ........ ٦١
پشتیوانی کارتێلی مێدێلین لە کۆنتراکان ........ ٦٤
قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لە لایەن کۆنتراکانەوە ........ ٦٦
لەچ شتێك و کەی ئاگاداربوون ؟ ........ ٧٣
ئێوە بڕیار بدەن: ئایا تیرۆریزم تاوانێکی ڕێکخراوە ؟ ........ ٧٧
تیرۆریزمی ناوخۆیی (Domestic Terrorism) ........ ٧٩
دانانەوەی بۆمب لە شاری ئۆکلاهۆما ........ ٨٤
چەپی ئایدیۆلۆژی ........ ٨٧
ڕاستی ئایدیۆلۆژی ........ ٩١
تیرۆریزمی ناوخۆیی: لایەنگرانی بەرزێتی سپیپێستەکان و گروپە نەفرەتخولقێنەکان... ٩٣
لەدایکبوونی میلیشیا ........ ٩٨
ڕووداوە دەستپێکەرەکانی بزاڤی میلیشیا ........ ١٠١
گروپە تیرۆریستییە ناوخۆییەکانی دیکە ........ ١٠٤
گروپەکانی شوناسی مەسیحی ........ ١٠٤
ناسیۆنالیستە سپیپێستەکان ........ ١٠٥
بەرزێتیخوازانی سپیپێست: هەڵوێستی سێیەم ........ ١٠٦
نێونازییە کەللە پێستییەکان ........ ١٠٧
کەللە پێستییەکان ........ ١٠٨
سۆرڤیڤالیستە نەژادپەرستەکان (Racial Survivalists) ........ ١٠٩
نەوەی پێنجەمی گروپەکانی کوکۆلاکس کلان ........ ١١٠
هێزە ئاسایشە جەماوەرییەکان ........ ١١٠
پۆپۆلیستەکان ........ ١١١
چالاکییە تیرۆریستییە یەك مەبەستەکان ........ ١١٤
چالاکی دژی لەباربردنی کۆرپەلە ........ ١١٥
ڕووداوە تاوانکارییەکان ........ ١١٨
ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە تیرۆریزمدا ........ ١٢١
جڵەوکردنی تیرۆریزم ........ ١٢٢
گەڵاڵەی دژە تیرۆریستی ١٩٩٦ ........ ١٢٣
چی فێربووین ؟ ........ ١٤١

## دەستپێك

لە هاوینی ساڵی **١٩٩٦** لە ماوەی پێنج حەفتەدا سێ رووداوی تیرۆریستی تۆقێنەر خەڵکی ئەمەریکایان هەژاند. لەکاتی یارییەکانی ئۆلۆمپیکی ئەتلەنتا، لە رۆژی هەینی واتە **٢٦**ی تەمووز بەهۆی تەقینەوەی بۆمبێك لە پارکی ئۆلەمپیکی سەدە (Centennial Plympic Park) دوو کەس کوژران و زیاتر لە ١٠٠ کەسی دیکە برینداربوون. **٩** رۆژ بەر لەم رووداوە لە رێکەوتی **١٧**ی تەمووز فڕۆکەی T.W.A لە کاتی ئەنجامدانی هەشسەدەمین گەشتی خۆیدا کەوتە خوارێ و **٢٣٠** کەس لەسەرنشینەکانی لە ئاوەگرگرتووەکانی کەناراوی نیۆیۆرك کوژران. جگە لەمانە تەقینەوەی گەشتی ئاسمانی ژمارە (**٧٤٧**) کە بۆ پاریس دەچوو، یەکێك لە دڵتەزێنترین رووداوەکانی مێژووی ئەمەریکای تۆمار کرد. بەر لەم رووداوە کارەساتاوییانە، **٣** حەفتە پێشتر واتە لە رێکەوتی **٢٥**ی حوزەیران کردەوەیەکی تیرۆریستی کوشندەی دیکە ئەنجام درا: بۆمبێك لە بنکەیەکی سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە زەهرای سعودیە تەقییەوە، **١٩** سەربازی ئەمەریکی لەم بنکەیە کوژران. ئەم کارەساتە چووە پاڵ چەند رووداوی دیکە کە ساڵی **١٩٩٣** بەدواوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای گرتەوە، ئەم واقیعە روو لە هەڵکشانە، دەیسەلمێنێ کە تیرۆریزم چیدی پرسێك نییە، تەنیا کاریگەری لەسەر وڵاتانی دیکە جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەبێت و هەروەها دەریدەخات کە کردەوە تیرۆریستیەکان زۆربەیان پێویستیان بە



هەماهەنگییەکی ستراتیژی هەیە لە نێوان گروپە تاوانکارییە رێکخراوەکان. بەگومانی زۆربەی خەڵك، پەشۆکاوی ئەم دواییانەی ئەمەریکاییەکان لە تیرۆر بۆ **٢٦**ی شوباتی **١٩٩٣** دەگەڕێتەوە، کە لەو رێکەوتەدا ئۆتۆمبێلێکی بۆمبرێژکراو لە ژێر باڵەخانەی ناوەندی بازرگانی جیهانی لە مانهاتن تەقییەوە و کوژرانی ١١ کەس و برینداربوونی پتر لە ١٠٠ کەسی لێکەوتەوە. لەو کاتە بەدواوە لە هەموو شوێنە گشتییەکانی ئەم وڵاتەدا هەوڵ و چالاکییە ئەمنییەکانیان چڕتر کردووە. ئامێرە کانزادۆزەرەوەکان کە جاران تەنها لە شوێنی هاتنە ژوورەوە لە رێڕەوی تێپەڕبوونی گەشتیارەکان لە فڕۆکەخانە دادەنران، لە دوای رووداوە تیرۆریستیەکانی ئەم دواییەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بەردەم زۆربەی باڵەخانە گشتییەکانی ئەم وڵاتەدا دانراون. لە راستیدا لە ساڵی **١٩٩٥** بە هۆی داخرانی شەقامی پێنسلڤانیا لە بەردەم هاتووچوی ماشێنەکان کە بۆ پارێزگاری لە کۆشکی سپی لە بەرامبەر هێرشە توندوتیژە چاوەڕوانکراوەکان ئەنجام درا، چیدی خەڵکی دەرگای بەناوبانگی بەردەم کۆشکی سپی نابینن.

زۆربەی کردە تیرۆریستیەکاندا سێ گروپی سەرەکی بەشدارن: ئەنجامدەر، قوربانی سەرەکی و ئەو کەسانەی کە ئامانج و مەبەستی تیرۆریستانن. ئەگەرچی زۆربەی کات دۆزینەوە و ناسینەوەی ئەنجامدەر یان ئەنجامدەرانی کارە تیرۆریستیەکان دژوارە، قوربانیانی هێرشەکە بەگشتی زۆرترین باس و مشتومڕیان لێدەکەوێتەوە. ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی لێڵی و سەرلێشێواوی سەبارەت بە تیرۆریزم ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی تیرۆریزم، وەکو شێوازێك لە توندوتیژییەکی ناباو و کەم هێز و کز لە کۆتایی چەماوەی روو لە خوارێی شەڕ لێکدەدرێتەوە. تیرۆریزم لەم

تیرۆانینه ناواقیعانەدا پتر کردەوەیەکی جەنگییە، نەك چالاکییەکی تاوانکارییانە. ئەم لێکدانەوەیە وا نیشان دەدات کە تیرۆریستان خاوەن ئامانجن و، جۆرێك لە ڕێز و پایەو پلەیان پێ دەبەخشێت و کارەکانیان دەخرێتە نێو ئەو ڕەفتار و ئاکارانەی کە لەلایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە قەبووڵ کراون. لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی خەڵك لەسەر ئەم بابەتە هاودەنگن کە بۆمبڕێژکردنی باڵیۆزخانەکان و بارمتەگری سیاسی و ڕفاندنی فڕۆکە کردەوەگەلێکی تیرۆریستی تاوانکارییانەن. بەم پێیە زۆربەی خەڵك لەو باوەڕەدان ئەم کردەوانە بۆ هەژاندنی خەڵك و تۆقاندنیان داڕێژراون و لەم ڕووەشەوە ئەم جۆرە کردەوانە لە دەرەوەی سنووری پەیماننامە جەنگییەکان جێ دەگرن.

لێرەدا، لە تیرۆریزم وەکو تاوانێکی ڕێکخراو (Organized crime) دەکۆڵینەوە. هەندی کەس لەو باوەڕودان لەبەرئەوەی کە زۆربەی کارە تیرۆریستیەکان لە هۆکار و پاڵنەرێکی سیاسی یان ئایدیۆلۆژیەوە سەرچاوە دەگرن، نەك لە هاندەری بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ئابووری، بۆیەش ناتوانرێت ئەم کردەوانە وەکو شێوازێکی تاوانی ڕێکخراو لەقەڵەم بدرێن.

ئەگەرچی ئەم وتەیە تاڕادەیەك حەقیقەتی تێدایە، بەڵام بە باوەڕی ئێمە ڕەنگە زۆربەی کارە تێرۆریستیەکان هاوکات هەم بەرنامەی سیاسی و هەم پاڵنەری بەدەستهێنانی بەرژەوەندی تیدابێت. بۆیە دەبێ سەرەتا بەتاوانی ڕێکخراو پێناسە بکەین. ساڵی ١٩٨٦ کۆمیسیۆنی تاوانە ڕێکخراوەکان بەسەرۆکایەتی سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، گرووپی تاوانبارە ڕێکخراوەکانیان



پێناسە کرد. بەهۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کارە تیرۆریستیەکان لەلایەن کەسانێکەوە ئەنجام دەدرێن کە ئەندامی گروپێکی خاوەن ڕێبەری دیارو ناسراو یان تەنانەت ئەو گروپانە کە خاوەن فەرماندەییەکی دابەشکراو و تاڕادەیەکیش پیشتیوانی کۆمەڵایەتین، ڕەنگە بتوانین بە دروستی ژمارەیەکی زۆر لە گروپە تیرۆریستیەکان بە تاوانباری ڕێکخراو لەقەڵەم بدەین. بۆ نموونە گروپی "ڕێگای درەوشاوە"ی پیرۆ کە نزیکەی ٤ تا ٥ هەزار ئەندامی هەیە بە مەبەستی دابینکردنی بودجەی پێویست بۆ پارێزگاری لە پرۆگرامە سیاسی و نەتەوەییەکەی ساڵانێکی زۆرە کێڵگەکانی بەرهەمهێنانی کۆکاینیان خستۆتە ژێر چاودێری خۆی. بە هەمان شێوە زۆربەی گروپە پەنابەرە کۆبابییەکانی دژی کاسترۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دابینکردنی پارەوپوڵی پێویست بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە سیاسییەکانیان، هەندێ کردەوەی نایاسایی وەکو دامەزراندنی سەندیکاکانی قوماربازی و هێنانە ژوورەوەی کۆکایین و لەخشتەبردی خەڵك ئەنجام دەدەن. هەروەها دەتوانین بەڵگە لەسەر ئەوە بهێنینەوە کە قاچاغی کردن بەهیرۆیین لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتەکانی شەڕی ساردی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی، چونکە ئەم دەوڵەتانە بەمەبەستی هەوسارکردنی نفوز و دەسەڵاتی کۆمۆنیستیەکانی چین، ئەم ماددانەیان لە چوارچێوەی سێگۆشەی زێڕینی پیشتیوانە لۆجستیکی و یارمەتییە سەربازییەکان دەخستە بەر دەستی زۆربەی شەڕکەرەکانی کۆمین تانگ (Kuomintang).

## پێناسەی تیرۆریزم

تیرۆریزم بە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەوە هەموو جیهانی گرتۆتەوە و لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکەم لە روانگەی جێبەجێکردنی یاساوە یەکێکە لە ئاڵۆزترین و دژوارترین پرسەکان کە رووبەرووی بووینەتەوە. پێناسەی وشەی تیرۆریزمیش وەکو زاراوەی تاوانی رێکخراو بە هۆی بەرفرەوانی و ئاڵۆزییەکەی دژوارە. بەر لەوەی دەست بە باسەکەمان سەبارەت بە پەیوەندی نێوان تاوانی رێکخراو و تیرۆریزم بکەین، دەبێ مانای ئەو وشەیە (تیرۆریزم) بخەینە بەر چاومان. هێشتا نە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و نە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێناسەیەکی فەرمی تیرۆریزمیان نەخستووتەڕوو، بەڵام زۆربەی پسپۆران لەسەر ئەوە تەبان کە تیرۆریزم ئاماژە بە ئاکارێکی تاوانکاریانە و توندتیژ دەکات، کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی سیاسی ئەنجام دەدرێت. لە نووسینە هاوچەرخەکاندا، تیرۆریزم پەیوەندییەکانی نزیکی لەگەڵ وشەی (گریلا) هەیە دەتوانرێت بە ((شەڕی ورد)) پێناسە بکرێت[1]. دانیەڵ جۆرجێ - ئابییێ (Daniel Georges-Abeyie) لەسەر ئەو بنەمایە کە گروپە تیرۆریستیەکان پتر لە شارەکان کۆبوونەتەوە، هێرشەکانیان زیاتر مەدەنییە بێتاوانەکان و ماڵ و سامان دەگرێتەوە و لە چوارچێوەی گروپگەلێکی بچووك یان دەستەگەلێکی سێ تا پێنج کەسی چالاکی دەکەن، جیاوازی دەکات لە نێوان ئەم دوو چەمکە[2].

باس و روونکردنەوەی تیرۆریزم لە زۆر رووەوە ئاسانترە لە پێناسەکەی. لە بنەڕەتدا تیرۆریزم بریتیە لە کەڵك وەرگرتن لە توندوتیژی بەشێوەیەکی نایاسایی



یان هەڕەشەی بەکارهێنانی توندوتیژییە دژی ماڵ و سامان یان خەڵك بەمەبەستی بەرەوپێشبردنی ئامانجە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. تیرۆر بەئامانجی نانەوەی ترس و تۆقاندن یان ناچارکردنی حکومەت و گروپ و کەسەکان بۆ گۆڕینی هەڵسوکەوت و سیاسەتەکانیان ئەنجام دەدرێ. لە ساڵی ١٩٩٥ ئەنیستیتۆی نەتەوەیی داد (National Institute of Justice)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رایگەیاند، کە دەوڵەت و رێکخراوە ناوچەییەکانی بەرێوەبەری یاسا لەو باوەڕەدان تیرۆریزم بەرفرەوانترە لەو ئامارە فەرمییانەی کە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (ئێف بی ئای) پێشکەشی کردووە. لە راستیدا کۆمەڵە رێکخراوێکی زۆریان وەکو نیونازییەکان، بەرهەڵستکارانی فیدراڵیزم، گروپە پارێزگاریکەرەکانی مافی ئاژەڵان، لایەنگرانی پاراستنی ژینگە و گروپە نەیارەکانی کوشتنی کۆرپەیان بە تیرۆریست لەقەڵەم دا[3]. زۆر روون و ئاشکرایە ئەو گروپانەی تاوانی رێکخراو ئەنجام دەدەن و ئامراز و پاڵنەری ئەنجامدانی کاری تیرۆریستییان هەیە، خاوەن سەرچاوەیەکی تاوانکارییانەی هاوشێوەن.

تاکتیکەکانی تیرۆریستان شێوازی جۆراوجۆریان هەیە، کە هەندێکیان بریتین لە بارمتەگیری، رفاندنی فڕۆکە، کوشتن، فێڵ و تەڵەکەبازی، دانانەوەی بۆمب و تەقەی کوێر و بەبێ بوونی مەبەستێکی دیاریکراو. سەیر ئەوەیە کە زۆربەی قوربانیانی کردەوە تیرۆریستیەکان پەیوەندییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەو شتەی کە بۆتە هۆی نارەزایی تیرۆریستان نییە، یان رۆڵێکی ئەوتۆیان نییە لە وەدیهێنانی ئامانج و ویستەکانیان. دەتوانین تەقینەوەی باڵەخانەی ئالفرێدی پی مۆرا

(Alfred P. Murrah Federal) لە شاری ئۆکلاهۆما لە ١٩ی نیسانی ساڵی ١٩٩٥ کە بەلای کەمەوە لە روانگەی تیرۆریستانەوە ئەوپەڕی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە وەك کردەوەیەك تیرۆریستی لێکبدەینەوە. ئەم رووداوە جگە لەوەی کوژرانی ١٦٨ کەس (لەوانەش ١٩ منداڵ) و دروستبوونی ترس و تۆقاندنێکی بەرچاوی گشتی لێکەوتەوە، سەرنجی هەمووانی بۆ لای خودی تیرۆریستان و ئامانجەکانیان راکێشا. بەڵام لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییدا ئەمە یەکەمین جار نەبوو، هاووڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ماڵ و سامانەکانیان دەبوونە ئامانجی تیرۆریزم. لە ساڵی ١٩٨٧وە هێرشە تیرۆریستیەکان کە بەگشتی لەلایەن گروپە تیرۆریستییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام دراون، بوونتە هۆی کوژرانی پتر لە ٤٠٠ ئەمەریکایی لەو شوێنانەی کە مولکی ویلایەتە یەکگرتووەکانە لە دەرەوەی وڵات[٤]. هەر لەم باسەدا برێك لە پێشتر چاوێکی وردتر دەخشێنێتە سەر رووداوی بۆمبڕێژی شاری ئۆکلاهۆما لە ساڵی ١٩٩٥. کردەوەیەکی تیرۆریستی بێ وێنەی دیکە هەر لە ساڵی ١٩٩٥ لە شاری تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن روویدا. ئەندامان و لایەنگرانی فیرقەیەکی ئایینی بە کەڵك وەرگرتن لە گازێکی دەماری کوشندە لە شەمەندەفەرێکی موسافیربەری شار بووە هۆی کوژرانی ١٢ کەس و برینداربوونی هەزاران کەسی دیکە. ئەم رووداوانە تەنیا دوو نموونەی ئەو هەموو رووداوە تیرۆریستیانەن کە لەم دواییانەدا لە گۆشە و کەناری جیهان روویانداوە.



## تیرۆریستەکان چ جۆرە کەسانێکن

لەسەرتاسەری جیهان بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی زۆر جۆراوجۆر بۆتە هۆی دروستبوون و سەرهەڵدانی گروپە تیرۆریستییەکان. ئەو کەسانەش کە ئەم جۆرە کردەوانە ئەنجام دەدەن لە رووی تەمەن و نەژاد و پێشینەی کەلتووری جیاوازن. لە ساڵی ١٩٨٦دا «هێزی تایبەتی سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دژایەتی تیرۆریزم» رایگەیاند نزیکی٦٠٪ ی دانیشتوانی جیهانی سێیەم لە ژێر ٢٠ ساڵ و، نیوەی ئەمانەش ١٥ ساڵانن یان کەم تەمەنترن، لەم بارودۆخەدا رێکخستنی ورد و ناسکی ئارەزووەکانی لاوێتی لەگەڵ شکستی ئابووری و سیاسی لەم وڵاتانەدا دەبێتە هۆی دروستبوونی شەپۆلێکی چاوەڕوانکراو لە تیرۆریستان. تیرۆریستەکانی ئەمڕۆ باوەڕێکی قوڵیان بە دادپەروەرانەبوونی ئامانجەکانیان هەیە. ئەوان تووڕە و نەترسن و گرنگییەکی ئەوتۆ بە گیانی خۆیان نادەن. ئەو چەکانەی تیرۆریستان کەڵکی لێوەردەگرن بەزۆری لە بازاڕە رەشە نێودەوڵەتییەکانی چەك و تەقەمەنی دابین دەکرێن و رەنگە لەو فرۆشیارە یاساییانەی کە تاڕادەیەکی زۆر کارەکەیان دیسپلین و بنەمایەکی ئەوتۆی نییە بەدەست هێنرابێت. زۆربەی تیرۆریستان دەتوانن بە یارمەتی پێکهاتەی رێکخراوەیی گەشەسەندووی خۆیان لە بارەی ئامانجە هێزەکیەکان هەروەها رێوشوێنی ئاساییشی پەیوەست بەو نیشانە و مەبەستانە لە کاتێکی گونجاودا نوێترین زانیاری بەدەستبهێنن. هاوکات لەگەڵ زیادبوونی گوشاری دەوڵەت لە دژی تیرۆریستان، ئەوانیش تەنیا لە دەوری مەبەستی سادەتر کۆدەبنەوە.

تیرۆریستەکان دەتوانن بەشێکی ڕێکخراوێکی گەورەو بەرفرەوان بن، یا ڕەنگە تەنیا بەهەماهەنگی لەگەڵ چەند کەسێك کە خاوەن بیروباوەڕی هاوشێوەن کاری تیرۆریستی ئەنجام بدەن. ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین بەنزیکەی ٣٠٠ ئەندام کە لە چوارچێوەی سێ گروپدا کاردەکەن و ڕێکخراوی ئەبونیزال کە بانگەشەی ٥٠٠ ئەندامی گۆڕەپانی چالاکی نێودەوڵەتی دەکات، دوو نموونەی ئەم ڕێکخراوە تیرۆریستییە مەزنانەن. زۆربەی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان زیاتر لە هەزار ئەندامیان هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا «وایت» مکوڕە لەسەر ئەوەی کە زۆربەی گروپە تیرۆریستییەکان کەمتر لە ٥٠ ئەندامیان هەیە و لە ژێر چاودێری فەرماندەیەك کە بەزۆری لە چەند ئەندامێکی کەم پێکدێت و لەسەر بنەمای کارو ئەرکی پێسپێردراوی تایبەت دابەش دەبن[٥]. بۆ نموونە بەشە هەواڵگرییەکان بەرپرسیاری ناسین و دیاریکردنی نیشانەو مەبەستەکانیانن و بەشە پشتیوانەکان کەلوپەلی ئەنجامدانی هێرشەکە دابین دەکەن و بەشە تاکتیکەکان کارە تیرۆریستیەکە ئەنجام دەدەن. ئەم گروپانە لە ڕووی ڕێکخراوەیی و چالاکییەوە زۆر وەك ئەو گروپانەی کە تاوانی ڕێکخراو ئەنجام دەدەن بنیاد دەکرێن.

ئەگەر بمانەوێ بەراوردێ بکەین، هەندێك لە کارە تیرۆریستییەکان لەلایەن کەسانێکی خاوەن بیروباوەڕی پتەوی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدرێن. یەکێك لەو تیرۆریستانە کە بە بومبدانەری نەناسراو (Un abomber) ناوبانگی دەرکردبوو لە ساڵی ١٩٧٨ بە شازدە جار بۆمبگوزاری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توانی بووی ٣ کەس بکوژێت و ٢٢ کەسی تریش بریندار بکات. گومانباری سەرەکی لە دۆسییەی بۆمبدانەری نەناسراو لە ساڵی



١٩٩٦ دا لە لایەن (ئێف بی ئای)ەوە دەستبەسەر کرا. هەندێك بەڵگە بەدەستکەوت نیشانی دەدا کە تیۆدۆر کازینسکی (Theodre Kacyznski) خوێندکاری هارڤارد و گۆشەنشینی ناوچەیەکی گوندی مۆنتانا (Montana) بەرپرسیاری دوو دەیە حاکمییەتی ترس و تۆقاندن بووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. بۆمبدانەری نەناسراو لە ڕوانگەی خۆی و جێبەجێکارانی یاسادا وەك ئامانجێکی وەدەست نەهاتوو لەقەڵەم دەدرا. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٥ ئەو بەهۆی هەڕەشەی تەقاندنەوەی فڕۆکەیەك لە کالیفۆرنیا هەموو خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای خستە ناو ترس و تۆقاندن و دوایی وتی ئەم هەڕەشەیە گاڵتە بووە و، بەڵێنیدا ئەگەر ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز یان واشینگتۆن پۆست ڕاگەیەندراوە ٣٥ هەزار وشەییەکەی کە بۆی ناردبوون، بڵاوبکەنەوە، ئەوە واز لە کوشت و کوشتار دەهێنێنێت. هەردوو ڕۆژنامەکە گوڵبژێرێك لەو ڕاگەیەندراوەیان لە دووی ئابی ساڵی ١٩٩٥ بڵاوکردەوە. ئەو بۆمبدانەرە لە ڕاگەیەندراوەکەیدا نووسیبووی: "شۆڕشی پیشەسازی ئاکامەکانی پڕ کارەسات بووە. کەم تا زۆر هەمووان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئێمە لە کۆمەڵگایەکی پڕ لە گێروگرفت دەژین... پێویستە پڕوپاگەندەو پەرە بە ئایدیۆلۆژیایەك بدەین کە دژی تەکنەلۆژیاو سیستەمی پیشەسازییە".

دۆسییەی بۆمبدانەری نەناسراو تواناو هێزی تیرۆریستی ناوخۆیی دەرخست و ئەمەش لە کاتێکدایە کە تاوانەکانی ناو ئەو دۆسییەیە بەدڵنیاییەوە لە لایەن کەسێکەوە ئەنجامدرا بوو. تیرۆریستان چ بەشێوەی کۆمەڵ کاربکەن و چ بەشێوەی تاکەکەسی، لە هەردوو حاڵەتدا هەڕەشەیەکی سەرەکین لەسەر ئاسایشی هەموو

کۆمەڵگا. خاوەن راکان لەسەر ئەم خاڵە کۆکن کە باشترین ڕێگای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم ئەوەیە کە جێبەجێکارانی یاسا لە بارەی پاڵنەرەکان و پێکهاتەی ڕێکخراوەیی گروپە تیرۆریستییەکان زانیاری بەدەستبهێنن و هەروەها یاسای چاودێری ئەم جۆرە کردەوانە بەدووربینییەوە جێبەجێ بکرێت.

## جۆرەکانی تیرۆریزم

لەبەرئەوەی پاڵنەر رۆڵێکی گرنگی لە ناسینی تیرۆریستان هەیە، لێرەدا نۆرەی ئەوەیە کە لە باوترین جۆرەکانی تیرۆریزم بکۆڵینەوە. جۆناتان وایت ( Jonathan White) لە کتێبەکەیدا لە ژێر ناوی (دەروازەیەك بۆ تیرۆریزم) جیاوازی لە نێوان پێنج جۆرە تیرۆریزم دەکات: تیرۆریزمی تاوانکاری (Criminal Terrorism)، تیرۆریزمی ئایدیۆلۆژی، تیرۆریزمی ناسیۆنالیستی، تیرۆریزمی دەوڵەتی و تیرۆریزمی شۆڕشگێڕانە[٦].

تیرۆریزمی تاونکاری بریتییە لە کەڵك وەرگرتن لە تیرۆر بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ماددی یان دەروونی[٧]. بەپێی ئەم پێناسەیە تیرۆریزمی تاوانکاری و سیاسی جیاوازییەکی روون و ئاشکرایان هەیە. لە بواری توندوتیژی دا تیرۆریزمی تاوانکاری وەك تیرۆریزمی ناسیۆسیالیتی سەرنجراکێش نییە. هەندێك لە خاوەن راکان تیرۆریزمی تاوانکاری وەکو مارکێك بەکاردەهێنن لە بارەی تیرۆریزمی ناوخۆیی، چونکە لە روانگەی ئەوانەوە تیرۆریزمی ناوخۆیی لە بنەڕەتدا جۆرێك چالاکی تاوانکارییانەیە. هۆی ئەم لێکدانەوەیە ئەوەیە کە تیرۆریستانی ویلایەتە



یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە روالەتدا ئالۆز نین و هیچ پشتیوانییەکی سیاسیان نییە و ئەمەش تایبەتمەندی تیرۆریستانی بەشەکانی دیکەی جیهانە[٨]. لەم رووەوە پرسی کۆنترۆڵکردنی چالاکییەکانی تیرۆریستە ناوخۆییەکان بە پرسێك لە پرسەکانی جێبەجێکردنی یاسا دەژمێردرێت.

تیرۆریزمی ئایدیۆلۆژی بەشێوەیەکی گشتی جۆرەهەوڵێکە بۆ گۆڕینی دەسەڵاتی سیاسی حوکمدار. بە باوەڕی هەندێك کەس تیرۆریزمی ئایدیۆلۆژی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش، بەڵام هەمیشە بەم شێوەیە نییە. بۆ نموونە، هەندێك لە حکومەتەکان لە کۆمەڵێك دەستەی کوشتن کەڵك وەردەگرن، کە لە روالەتدا کردەوەکانیان بەشێك لە سیاسەتە سەرکوتکەرییەکانی دەوڵەتە. بەڵام بە کردەوە دەتوانین ئەم تیرۆریستانە وەك زیادەی تیرۆریستە شۆڕشگێڕەکان لە قەڵەم بدەین.

تیرۆریزمی ناسیۆنالیستی جیاوازە لە تیرۆریزمی ئایدیۆلۆژی و تایبەندمەندی هەرە روونی ئەم جۆرە تیرۆریزمە ئەوەیە، کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی لە ڕێگای جۆرێك لە چالاکی تیرۆریستی هەوڵدەدات پشتیوانی لە بەرژەوەندییەکانی گروپێکی نەتەوەیی یان میللی بکات[٩]. تیرۆریستە ناسیۆنالیستەکان بەزۆرینە لەگەڵ ئایدۆلۆژیا رۆژئاوایی و رۆژهەلاتییەکان هاوتەریب دەبن. دەتوانین بڵێین ئەم شتەش بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی زلهێزەکانە (وەکو خۆراك، کەلوپەل و چەك...) بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ناسیۆنالیستەکان. بە واتاییەکی دیکە دەتوانین بڵێین رۆژئاوا تیرۆریستەکانی خۆی ئامادە و ڕێکدەخات و رۆژهەلاتیش تیرۆریستەکانی خۆی.

بە واتایەکی دیکە ئامانجەکانی «دیموکراسی» لە بەرامبەر ئامانجەکانی «سوسیالیزمی مارکسیستی» دەوەستن[١٠].

تیرۆریزمی دەوڵەتی کاتێك دێتە ئاراوە کە سیستەمە دەسەڵاتدارەکان لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان و لە دەرەوەی رێوشوێنە دیپلۆماتییکە چەسپاوەکان توندوتیژی دەنوێنێن یان هەڕەشەی بەکارهێنانی توندوتیژی دەکەن.

ئەم زاراوەیە تیرۆریزمی دەوڵەتی لەسەردەمی رێگانی سەرۆك کۆمار بۆ ئاماژەکردن بەو توندوتیژییەکزانە هاتە ئاراوە کە دەکرایە سەر شوێنی دیپلۆمات و دامەزراوە سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەم شێوەازی تیرۆریزم بە رووداوگەلێکی وەکو گرتنی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە تاران لە ساڵی **١٩٧٩** و ئەو بۆمبڕێژییانەی کە لە دژی کادیرە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتی ناڤین ئەنجامدرا، دەناسنەوە. ئەو دەوڵەتانەی پاڵپشتی لەو جۆرە کردەوانە دەکەن بە دەوڵەتە تیرۆریزمەکان ناوزەد دەکرێن. هەر کام لەم دەوڵەتانە کە بە هۆی جۆراوجۆرەوە پشتیوانی لە تیرۆریزم دەکەن، بۆ نموونە لە رێگا سیاسی و سەربازییەکانی دیکەوە دەستەبەر نابێت. جاری وا هەیە دەوڵەتەکان بۆ ئەوەی لە نێو بزووتنەوە ئایدیۆلۆژییەکان پێگەیان هەبێت و دەسەڵات و هێزیان پتەو بکەن، پشتیوانی لە تیرۆریزم دەکەن. بەم حاڵەشەوە هەندێك لە کردەوە تیرۆریستییەکان بە پشیتوانی دەوڵەتەکان ئەنجام دەردێن بۆ کورژاندنەوەی ئاگری دژایەتی لە ناوەخۆی وڵات لە رێگای کوشتنی نەیاران لە دەرەوەی وڵات. دەڵێی بەرپرسیارێتی ئەم جۆرە کردەوانە سووکترە. بەکارهێنانی تیرۆریزمی دەوڵەتی ئەم



بابەتە روون دەکاتەوە کە کەڵك وەرگرتن لەم جۆرەی تیرۆر بۆ رێنوێنی بەرەوپێشچوونی سیاسەتە دەرەکییەکان مەترسی و خەرجییەکی کەمی دەوێ. ئەو تیرۆریستانەی لەلایەن دەوڵەتەکانەوە پاڵپشتی دەکرێن، دەتوانن لەو یارمەتییانە کەڵك وەرگرن کە خۆی لە چەك یان تەقەمەنی، پەیوەندی، بەڵگەی سەفەرو حەشارگەی ئەمنی بۆ راهێنان و چالاکی دەبینێتەوە. بەدواداچوون و دۆزینەوەی کردەکان زۆر دژوارە، ئەمەش بەشێوەیەکە ئەو دەوڵەتانەی یارمەتیان دەدەن، دتوانن رێز و شەرعییەتی خۆیان لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بپارێزن و لە هەمان کاتیشدا ئامانجەکانیان بەشێوەیەکی شاراوە لە بواری دارایی دەستەبەر بکەن و یارمەتییان بدەن و پشتیوانییان لێ بکەن.

تیرۆریستە شۆڕشگێڕەکان کەسانێکن کە تاکتیکە نیمچە پارتیزانییەکانیان هەم خاوەن دەسەڵاتە سیاسییەکان و هەم پشتیوانەکانیان تووشی ترس و تۆقان دەکەن. ئامانجی ئەم تیرۆریستانە ئەوەیە دەسەڵاتدارانی ئێستا لەسەر کار لابەرن و رابەرانێکی سیاسی هاورێیان بهێننە سەر کار. ئەو تاکتیکە باوانەی تیرۆریستان کەڵکی لێ وەردەگرن بریتین لە بارمتەگری و دانانەوەی بۆمب و کوشتار و هەموو ئەمانەش ژیرانە و بەمەبەستی ناچارکردنی حکومەت بۆ ئەنجامدانی کاردانەوە لەدژی ئەم کردەوە سەرکوتکەرانەیە، ئەنجام دەدرێن. ئەگەر ئەم کاردانەوەیە ئەنجام بدرێ تیرۆریستان لە رێگای راگەیاندنە گشتییەکان هەوڵ دەدەن نامرۆڤبوونی حکومەت ئاشکرا بکەن و جەخت لەسەر پێویستبوونی رووخاندنی بکەنەوە. رووخاندنی حکومەتی چیانگ (Chiang Chi-Shek) لە چین لەلایەن موتسێ تۆنگ و رووخاندنی سەرکەوتووانەی رژێمی باتیستا لە کوبا

(لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٥٠) لەلایەن کاسترۆوە دوو وێنەی بەرچاوی تیرۆریزمی شۆڕشگێڕانەن.

ئەم پێنج جۆرەی تیرۆریزم بەهیچ شێوەیەك نوێنەر و نیشاندەری هەموو چالاکی و گروپە تیرۆریستییەکانی سەرانسەری جیهان نین. «جۆناتان وایت» جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە بە تیرۆریست ناسران بەزۆری پەیوەندی بەرەوابوونی ئەخلاق و ئاکاری گروپە ناوبراوەکانەوە هەیە[١١]. بۆ نموونە، ئایا دەتوانین ئەو گروپانەی لە هێز و توندوتیژی کەڵك وەردەگرن بۆ رووخاندنی تیرۆریستە شۆڕشگێڕە دیکتاتۆرەکان و خەباتگێڕانی رزگاری بە تیرۆریست لە قەڵەم بدەین؟ ئایا بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژی سیاسەتە کوشندەکانی دەوڵەتێك بەرگریی شەرعی یاساییە یان تیرۆریزمێکی ناسیۆنالیستانەیە؟ ئەم زاراوانە لێڵن، چونکە هەر کام لەو گروپانەی گیرۆدەی ئەم پرسیارانەن، لەو بارودۆخەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسییە تایبەتییەکان بەکارهێنانی توندوتیژی بەرەوا دەزانن.

## گوتەزاکانی تیرۆریزم

ئەمڕۆ تا چ رادەیەك تیرۆریزم بوونی هەیە؟ و لە ساڵانی داهاتوودا بە چ شێوەیەك گۆڕانی بەسەردا دێت؟ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە دژوارە، چونکە رۆژ لە دوای رۆژ خودی تیرۆریستان و ئامانجەکانیان ئاڵۆزتر دەبێت و دەگۆڕدرێن. لەگەڵ ئەمەشدا بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین لە بارەی ماهییەت و رەهەندەکانی



تیرۆریزمی نوێ چەند تێبینییەك بخەینە روو. دەتوانین گوتەزا جۆراوجۆرەکانی تیرۆریزم بۆ نموونە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی بخەینە بەر باس.

## گۆڕانکارییە نوێیەکانی تیرۆریزم

لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٠٠، پاڵنەرەکان، ستراتیژییەکان و چەکەکانی تیرۆریستان تاڕادەیەك گۆڕانیان بەسەرداهاتووە، لە ئانارشیست و گروپە تیرۆریستە چەپەکان کە شوێنی ئەوانیان گرتۆتەوە بگرە تا سوپای سوور لە دەیەکانی ١٩٧٠دا لە ئەڵمان و ئیتالیا و ژاپۆن چالاکییان ئەنجام داوە، هەموویان بارگە و بنەمایان تێکناوە و ئەمڕۆکە باڵی راستی توندڕەو ئاڵا هەڵگری ئەم جۆرە کردەوانەیە. بەم حاڵەوە ئەمڕۆکە بەشی هەرە زۆری تیرۆریزمە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەکان نە چەپن و نە راست، بەڵکو ماهییەتێکی نەتەوەیی و جیاخوازییان هەیە. تیرۆریستە ناسیۆلیستەکان لە چاو تیرۆریستە ئایدیۆلۆژییەکان خاوەن هێزێکی بەردەوامترن، چونکە خەڵك بەشێوەیەکی بەرفرەوان پاڵپشتیان لێدەکەن.

رەنگە بەرچاوترین گۆڕان لە دەیەکانی کۆتایی ئەوە بێت کە بە هیچ شێوەیەك تیرۆریزم تەنیا ستراتیژی خەباتگێڕییان نییە. گروپەکانی وەکو ئیخوان موسلمین، حەماس، سوپای رزگاریخوازی ئێرلەندا، بزووتنەوەی نیشتمانی و ئازادی باسك لە ئیسپانیا، توندڕەوەکانی کورد لە تورکیا و عێراق، بەبرەکانی تامیلی سریلانکا هەروەها زوربەی گروپەکانی دیکەی لەسەرەتادا هەم باڵی سیاسیان هەبووە و هەم

باڵی تیرۆریستی. «بازووی سیاسی» خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و فێرکردن پێشکەش دەکات و لە هەڵبژاردنەکاندا خەریکی رکابەرایەتی دەبێت لە حاڵەتێکدا «باڵی سەربازی» خەریکی ڕێگری و کوشتار دەبێت. ئەم جۆرە لە دابەشکردنی کار ئیمتیازگەلێکی روونی هەیە. کاتێك یەکەیەکی سەربازی بەراشکاوی کردەیەکی ستەمکارانە ئەنجام دەدات یان ئەگەر هەڵەیەك روویدا ئەوە ڕێبەری سیاسی دەتوانێ خۆی لێ بدزێتەوە. بانگەشەی نەبوونی کۆنترۆڵ دەتوانێ بەتەواوی راست بێ، چونکە لقی سەربازی دەیەوێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاربکات، پیاوان و ژنانی چەکدار و خاوەن بۆمب بەزۆرینە ئامانجە بەرینەکانی دیکەی بزووتنەوەکە لەبەرچاو دەخەن و رەنگە زیانیان لە قازانجیان زیاتر بێت.

کردەوە تیرۆریستیەکانیش بە لەبەرچاوگرتنی دابەزینی هەرچی زیاتری ڕێژەی فڕۆکە رفاندنەکان تاڕادەیەك گۆڕاون. ئەم شتەش لەبەر ئەوەیە کە فڕۆکە دزراوەکان بۆ هەمیشە ناتوانن لە ئاسماندا بمێننەوە و ئەمڕۆکەش ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی مۆڵەتی نیشتنەوەیان پێدەدەن کەمن. لە ساڵانی کۆتایی دەیەی ۱۹۰۰دا تیرۆریستان کەمتر مەیلیان هەبووە هێرش بکەنە سەر نیشانەو مەبەستێکی دیاریکراو (وەکو کاربەدەستە فەرمییەکانی لایەنی بەرامبەر)و پتر لە بیری کوشتاری کوێرانە و نادیاردا بوون. دەڵێی سنووری نێوان تیرۆریزمی شاری و تاکتیکەکانی دیکە کەم رەنگ بۆتەوە و سنووری نێوان ئەو تیرۆریزمەی پاڵنەری سیاسی هەیە لەگەڵ چالاکییەکانی سەندیکاکانی تاوانبارانی نەتەوەیی و نێو نەتەوەیی زۆر زەحمەتە دەستنیشان بکرێن. بەم حاڵەشەوە تاوانی نێودەوڵەتی و تیرۆریزم جیاوازییەکی بنەڕەتیان هەیە: گروپە تاوانبارە ڕێکخراوەکان کە مەیل



و پاڵنەری بەرژەوەندیخوازیان هەیە بەشێوەیەکی مکوڕانە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بەرووخاندن و لاوازکردنی کۆمەڵگاوە نییە. بە پێچەوانەوە، ئەوان وەکو مشەخۆرێك پێیان باشە خانەخوێیەکەیان ئابووریەکی گەشەسەندووی هەبێت.

تیرۆریزمی دەوڵەتی هێشتا لەناونەچووە. هەرچەندە چیتر تیرۆریستان ناتوانن پشت بەیەکێتی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی لە ئەوروپای رۆژهەڵات ببەستن، بەڵام هێشتاش هەندێك لە دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین و ئەفریقای باکور پشتیوانی لە تیرۆریستان دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێك لە دەوڵەتەکان دەیانەوێ بە پەنابردن بۆ مافی پیرۆز لە دەرەوەی سنوورەکانیان کردەوەی تیرۆریستی ئەنجام بدەن. هێرشتی ئاسمانی ساڵی ۱۹۸٦ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دژی لیبیا و ئابلۆقە جۆراوجۆرەکانی دژی لیبیا و ئێران لەو بارەوەیە رۆڵی هەبووە. ئەمڕۆکە هیچ دەوڵەتێك شانازی بەخۆیەوە ناکات کە خەریکی هاندان و پشتیوانی لە شەڕی نوێنەرایەتی بووە. بەم حاڵەشەوە بەبێ دەنگ و پەنگ سودان بۆتە حەشارگەیەکی هێمن بۆ تیرۆریستان هەر وەك لە چاخەکانی دیکەدا، کەنارەکانی ئەفریقای باکور بۆ دزە دەریاییەکان وەك بەهەشتێکی هێمن ئارام وابوون.

## کەڵك وەرگرتن لە چەکە کیمیاوی و میکرۆبییەکان

بەکارهێنانی سنوورداری چەکە کیمیاوییەکان هاوکات لەگەڵ بەکارنەهێنانی چەکە ناوەکییەکان لەلایەن تیرۆریستانەوە پتر پرسێکی تەکنیکیە. کتێبە

زانستییەکان زۆر بابەتی پەیوەست بە بەرهەمهێنان، دروستکردن، پاراستن و بەکارهێنانی ئەم سێ جۆرە چەکە ناباوەی تێدایە. نە دروستکردنی چەکە ناوەکییەکان ئەوەندە ئاسانە و نە بەکارهێنانیان. کەرەستە ناوەکییەکان کە سەرچاوەی کەمیان هەیە لە ژێر چاودێری ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ناوەکی دان. ئەم ئاژانسە یەکێکە لە رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان. لە روانگەی یاساوە تەنیا دەوڵەتەکان دەتوانن ماددەی ناوەکی بەرهەم بهێنن و لەم رووەشەوە تەنانەت لەم چاخەدا کە چاخی پەرەپێدانی ناوەکییە، پشکێنەران بەئاسانی دەتوانن ئەو لایەنانە بدۆزنەوە کە یارمەتیان بە تیرۆریستە ناوەکییەکان داوە. رەنگە لە پشکنینەکەدا چەکێکی ناوەکی سەرەتایی وەکو چەکە کەرتنەبووەکان لە قەڵەم بکەوێت، بەڵام ئەم شتە هیچ کاتێك لە بارەی کەرستەی ناوەکی تیشك هاوێژ روونادات. دەنگۆی ئەوە لە ئارادایە یاساوڵە ئێرانییەکان هەوڵ دەدەن لە تورکیا و کازاخستان ئەو جۆرە ماددەیە کە لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو هەیە، بکڕن.

بەرهەمێنان یان بەدەستهێنانی کەرەستەی کیمیایی ئاسانترە، بەڵام نە بەو رادەیەی بتوانن لە شوێنی جێگیرو بە ئاسوودەی دایبنێن و لە دەستدابوونیان تاڕادەیەکی زۆر پەیوەندی بەکەش و هەواوە هەیە. ئەو تیرۆریستانەی لە ساڵی ١٩٩٦ هێرشیان کردە سەر تۆکیۆ ئامانجێکی گونجاویان (شەمەندەفەری ژێرزەمینی) کە پڕ بوو لە خەڵك هەڵبژارد بوو. لە لایەکی دیکەوە مەوادی میکرۆبی زۆر مەترسیدارترن، چونکە دەتوانن سەدان هەزار کەس بکوژن، بەڵام مەوادی کیمیایی تەنیا دەتوانن هەزاران کەس لە ناوببەن. بەرهەمهێنانی ئەم



جۆرە چەکانە تاڕادەیەك ئاسانە، بەڵام کەڵەکەکردن و بەکارهێنانیان تەنانەت لە گازە دەمارییەکان زەحمەتترە. مەترسی گوێزرانەوەی ئەو مەوادانە بۆ ئەو کەسانەی لە دەستیان دایە ئەگەری زیاترە و زۆربەی بەکتریا و هاگە کوشندەکان ناتوانن لە دەرەوەی تاقیگە بمێننەوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم گرفتە تەکنیکیانە رەنگە تیرۆریستان بە بەراورد لەگەڵ مەوادی کیمیایی کەمتر دەرەتانی کەڵك وەرگرتن لەو مەوادی ناوەکییان هەبێت و تا کەمترین رێژەش ئەگەری بەکارهێنانی چەکە میکرۆبیەکان لەلایەن ئەوانەوە لە ئارادایە، بەڵام جاری وا هەیە دەتوانرێت ئەم گرفتانە چارەسەر بکرێت و لە کۆتاییدا هەڵبژاردنی چەکە ناباوەکان پەیوەندی بە پسپۆری و بەدیهێنانی ئەو مەوادە کوشندەیە هەیە لەلایەن تیرۆریستانەوە.

## تیرۆریزمی زانیاری

کۆمەڵگا لە بەرامبەر جۆرێکی نوێی تیرۆریزم زەرەرمەند بووە، کە لەو جۆرەدا هێزی وێرانکاری کەسی تیرۆریست و خودی تیرۆریزم وەکو تاکتیکێك زۆر زیاتر بووە. تیرۆریستەکانی پێشوو دەیانتوانی پاشا و دەسەڵاتدارە پایە بەرزەکان لە ناوبەرن، بەڵام دوای ئەوە هەمیشە هۆگرانێك هەبوون کە بۆ بەدەستهێنانی هێزی ئەو کاربەدەستە کوژراوانە زۆر بەخێرایی هەنگاو هەڵێنن، بەڵام کۆمەڵگا پێشکەتووەکانی ئەمڕۆ پتر بە کۆکردنەوەو سەرلەنوێ دۆزینەوەو لێکدانەوەو گواستنەوەی ئەلەکترۆنی زانیارییەکان بەستراونەتەوە. دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێت کە کاروباری بەرگری، ئاسایشی، بانکداری، بازرگانی، گواستنەوە، چالاکییە

زانستیەکان و بەشێکی بەرفراوان لە مامەڵەکانی کەرتی دەوڵەتی و تایبەتی لە ڕێگەی تۆڕەکانی کۆمپیوتەرەوە ئەنجام دەدرێت. ئەم بابەتە دەتوانێ ناوەندگەلێکی زۆر گرنگی ژیانی نەتەوەیی بخاتە بەر مەترسی ئەو خراپەکارانەی بەشێوەی ناڕەوا دێنە ناو ئەو تۆڕەوە و دەتوانن هەموو کاروبارەکانی دەوڵەتێك بشێوێنن. لەم رووەوەیە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ باسی " تیرۆریزمی زانیاری" زانیاری و "شەڕی سایبیرنێتیکی" پتر پەرەدەسەنێ.

لاکوار وتوویەتی: ئەگەر تیرۆریستێك یەك ملیار دۆلار و بیست خراپکاری کۆمپیوتەری ژیری لەبەر دەست دابێ دەتوانێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوبەرێ [١٢]. ئەم کۆمەڵگا تۆڕییە بواری شاراوەی ئەوتۆی نییە و ئەگەر بمانەوێ واقیعبین بین، دەبێ بڵێین ئەو هەوڵانەی بۆ پاراستن دراون نرخێکی کەمییان هەیە. بوونی خراپکارە تازە لاوە کۆمپیوتەرییەکان کە چونەتە ناو سیستەمە لە ڕادەبەدەر نهێنینیەکانیان، زۆربەی بوارەکان شایەتی ئەم حەقیقەتەیە. تەنانەت ئێستاش ئەگەری نانەوەی پاشەگەردانی کەم تا کورت بێ سنوورە و بە دڵنیاییەوە ئەگەر چوینە ناو سەدەی بیست و یەکەم ئەوا زیاتر زیانمان لێ دەکەوێت و ئامانجی چالاکییەکانی تیرۆریستان گۆڕانی بەسەردادێت. بۆ وێنە لە هەڵومەرجێکدا هێرشێکی بە بەرنامە بۆ سەر سویچنگێکی ئەلەکترۆنی دەتوانی ئاکامی زۆر مەترسیدار و چارەنووسسازی لێبکەوێتەوە، ئیتر بۆچی تیرۆریستان سیاسەتوانێك لەناوبەرن یان کوێرانە خەڵکی بێ تاوان بکوژن؟ بۆ نموونە، ناوەندی سویچینگ کۆلپێری (Culpeper) ڤێرجینا کە ناوەندی تۆڕی ئەلەکترۆنی بانکی فیدرالی ڕۆژرۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە هەموو



ئیعتبار و مامەڵە فیدراڵییەکان کۆنترۆڵ دەکات، ئامانجیشی روونە بۆ تیرۆریستەکانی زانیاریی سەردەمی ئێمە. ئەگەر ئەم تیرۆریزمە نوێیە هەموو هێز و وزەی خۆی لە شەڕێکی ئەلەکترۆنی بەکاربهێنێ، ئەوا هێزە وێرانکارییەکەی بە ڕێژەیەکی بەرچاو و تەنانەت لە چەکە میکرۆبی و کیمیاییەکانیش پتر دەبێ. بە ئەگەرێکی نزیك لە دڵنیاییەوە هێشتا هێرش بۆ سەر توانایی و هێزی دەوڵەت و کۆمەڵگاکان زۆر کەمتر جێگەی سەرنجی تیرۆریستەکانی داهاتووە، بە بەراورد لەگەڵ تاوانبارە ئاسایی و ڕێکخراوەکان. دزە ئەلەکترۆنییەکان جا چ خەریکی فێڵبازی بن لە ڕێگەی کارتی ئیعتبارییەوە یا خەریکی سیخوڕی پیشەیی بن ئەوا بەشێکن لەم سیستەمە، کە لە جیاتی ئەوەی لە ناویان بەرن، بەهرەیان لێوەردەگرن. هەرچی بێت ئەگەر ئەم سیستەمە بڕوخێت ئەوا سەرچاوەی داهاتەکەشیان لە ناو دەچێت و هەموو ئەمانەش ئێمە دەگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی کە تیرۆریزم زۆر بەرفراوانترە لەوەی کە ئێمە پێشتر دەمانناسی و، هەر بۆیەشە بۆ تێگەیشتن و ناسینی واقیعیەتە نوێیەکان زۆر پێویستە پێناسە و وشەی نوێ دابتاشین.

ئاژانسە هەواڵگرییەکان و سیاسەتوانان دەبێ فێری ئەوە بن، جیاوازی بکەن لە نێوان جۆرەکانی تیرۆریستان و هاندەرەکانیان و هەروەها لە نێوان ئاراستە و ئەو ئەنجامانەی خەریکن دەردەکەون.

## تیرۆریزمی نێودەوڵەتی

لە ٧ ئابی ساڵی ١٩٩٨ دوو ماشێنی بۆمبڕێژکراو لە کاتی تێپەڕبوونیان لە بەردەم باڵیۆزخانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە کینیاو تانزانیا تەقینەوەو پتر لە ٢٥٠ کەس کوژران و ٥٥٠٠ کەسی دیکەش بریندار بوون. ئەم کارەساتە بە یەکێك لە کوشندەترین هێرشە تیرۆریستییەکانی دەیەی ١٩٩٠ دادەنرێت. کەمێك دوای ئەم تەقینەوانە، پۆلیسی تانزانیا و کینیا دەستیانکرد بەدەستگیرکردنی گومانباران، بەڵام تەنیا کەسێکیان وەك بەرپرسیاری سەرەکی ئەم هێرشانە ناساند، ئەویش ئوسامە بن لادن بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەر بنەمای ئەو راپۆرتانەی ئاژانسە هەواڵگرییەکان لەبارەی ئوسامە بن لادن کۆیان کردبۆوە و تێیدا هاتبوو کە ئوسامە سەرقاڵی بەرنامەڕێژییە بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی تیرۆریستان لە بنکەیەکی نهێنی لە ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان. ئەمەریکا لە ٢٠ی ئابی ساڵی ١٩٩٨، ٧٥ مووشەکی تۆماهۆکی (Tomahawk) ناو پاپۆڕە جەنگییەکانی سەر دەریای عەرەبی و دەریای سووری لەو بنکە تیرۆریستیانە گرت. ئەم مووشەکانە وەك کردەوەیەکی تۆڵەسەندنەوە چەند ئامانجێکی لە ئەفغانستان و سوودان پێکان. بەپێی راپۆرتەکان ئەم کۆمەڵە فێرکرد نییە لە ناوەندێکی سەرکردایەتی و جبەخانەیەکی تەقەمەنی و چوار ناوەندی فێرکردن پێکهاتبوو. لەم کەمپانەدا تیرۆریستان لەسەر چۆنیەتی کارکردن بە تەقەمەنی و پەرینەوە لە بەربەستەکان ڕادەهێنران و هەروەها فێری ئەوە دەکران، بە چ شێوەیەك هێرش بەرنە سەر دوژمن و چۆن نەفەرهەڵگرو تانکەکان لێخوڕن. لە زەمانی ساندی بێگێر (Sandy Berger)،



راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەگێڕنەوە «ئەمە مەزنترین کەمپی ڕاهێنان و فێرکردنی تیرۆریستانە لە جیهان» [١٣]. شارەزایانی پرسە تیرۆریستییەکان لەو باروەڕەدان کە بن لادن (ئەم تیرۆریستە سعودییە) بە دامەزراندنی تۆڕێکی بەرفراوانی تیرۆریستی نێودەوڵەتی پەیڕەوکانی ناچار کردووە تا ئەمەریکییەکان بە سەربازو مەدەنی و گەورەو بچوککەوە بکوژن. ئامانجی ئوسامە ئەوەیە ئەمەریکا ناچار بکات واز لە هاوپەیمانان و دۆست و بەرژەوەندییەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و کەنداوی فارس و ئەفریقیا بهێنێت.

ئوسامە وەك زۆربەی ڕێبەرە تیرۆریستییەکانی دیکە هەوڵ دەدات تاوانەکانی خۆی لە ژێر پەردەی ئیسلام پاساو بدات، بەڵام سەیر ئەوەیە کە مەینەتبارترین قوربانیانی تیرۆریزم لە موسڵمانانی میسر، ئیسرائیل، کەناری ڕۆژهەڵاتی رووباری ئوردن، جەزائیر، لوبنان و وڵاتەکانی دیکە پێکهاتوون. ١٠ کەس لەو ١٢ کەسەی لە تەقینەوەکەی تانزانیا کوژران، موسڵمان بوون و هەروەها لەو ٢٦٠ کەسەی لە کینیا کوژران زۆربەیان موسڵمان بوون. هەرچەندە بەشی هەرە زۆری تۆڕی بن لادن نەدۆزراوەتەوە، بەڵام هەندێك لە چالاکییەکانی رابردووی بەباشی تۆمارکراون و بریتین لە:

١- سودان: ساڵی ١٩٩٦ دا بن لادن لە ژێر گوشاری ئەمەریکا لە سودان دەرکرا، بەڵام بە ئەگەرێکی بەهێز هێشتاش چالاکیی بازرگانی بەرفراوانی لەوێ هەیە. بۆ وێنە لە کارخانەکانی بەرهەمهێنانی ماددە سڕکەرەکان.

٢- ئەفغانستان: ئوسامە لە دەیەی ١٩٨٠ دا بەپاڵپشتی ئەمەریکا لە دژی یەکێتی سوڤیەت شەڕی کرد و کەمپی فێرکردن و ڕاهێنانی دامەزراند و تالیبانی لە بواری داراییەوە یارمەتی دا.

٣- کینیا و تانزانیا: کلینتۆنی سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بە پاڵپشتی هەندێك زانیاری بەهێز و ڕازیکەر گەیشتە ئەو بڕوایە، کە گەڵاڵەدارێژەری تەقینەوەکەی ٧ی ئاب کە بووە هۆی کوژرانی ٢٦٣ کەس، ئوسامە بن لادن بووە.

٤- عەرەبستانی سعوودی: زێدی بن لادن و سەرچاوەی میراتە چەند ملیۆن دۆلارییەکەی ئەوی لە وەرگرتنی ڤیزە بێبەشکرد. بن لادن سوێندی خواردووە خانەدانی پاشایەتی سعوودی لە ناوبەرێت.

٥- پاکستان: دانیشتنەکانی گروپە توندڕەوە ئیسلامییەکانی لە مانگی حوزەیران لە پیشاوەری پاکستان پێکهێنا. ئەو کاتەی لە پاکستان بوو بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا.

٦- یەمەن: زێدی باوکی بن لادن. بن لادن هەندێك پەیمانی لەگەڵ هۆزەکانی گرێداو و کۆمەڵێك کەمپی ڕاهێنان و فێرکردنی دامەزراندن.

٧- سۆمال: ساڵی ١٩٩٣ کۆمەڵێك سەربازی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەمەریکا خستە بەر دەستی دەوڵەتی سودان. دواتر بن لادن رایگەیاند کە زەرەرو زیانێکی قورسی لە ئەمەریکییەکان داوە.



٨- میسر: بن لادن یارمەتی پێشکەش بە توندڕەوە ئیسلامییەکانی میسر کردووە و ساڵی ١٩٩٥ بەتاوانی هەوڵی کوشتنی حوسنی موبارەك تۆمەتبار کراوە.

٩- بەریتانیا: دەنگۆی ئەوە لە ئارادایە کە ئەو گروپە جەزائیرییەی لە لەندەن جێگیربووە و بەتاوانی کۆمەڵێك تەقینەوە لە فەرنسا تۆمەتبار کراوە لە لایەن ئوسامەوە پشتیوانی دارایی کراوە.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٨دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بن لادنی بەوە تۆمەتبارکرد، کە دەستی هەبووە لە تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەکانی ئەم وڵاتە لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا لە مانگی ئاب و، خەڵاتێکی بێ وێنەی ٥ ملیۆن دۆلاری تەرخان کرد بۆ پێدانی هەر زانیارییەك ببێتە هۆی گیرانی ئەو. لەو شکایەتنامە ٢٣٨ بڕگەیەدا هاتووە کە ئوسامەو چەند کەسێکی دیکە یارمەتی داراییان داوە بەو تیرۆریستانەی لە ساڵی ١٩٩١ هێرشیان کردۆتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هەروەها ڕایانهێناون و فەرمانیان پێداون[١٤].

وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕایگەیاندووە ساڵی ١٩٨٦ لە سەرتاسەری جیهان ٨٥٦ کردەوەی تیرۆریستی ئەنجامدراوە. هەڵبەت ئەو ساڵە یەکێك لە پڕ جموجۆڵترین ساڵەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی بووەو، ساڵی ١٩٩٠ ژمارەی ئەم کردەوانە بۆ ٤٤٠ کردەوە، کەم بۆتەوە. هێشتاش تیرۆریزم لە ئاسیاو ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین باوە. پتر لە ٣٠ ساڵە گروپە تیرۆریستییەکانی ئەوروپا هێرش دەکەنە سەر دەوڵەتە سەرمایەدارەکان. بۆ

نموونە لە دەیەی ١٩٨٠دا گروپی ئەڵمانی بادێر ماینهۆف (Baader Meinhoff) زنجیرەیەك تەقینەوە و مرۆڤرفێنی و دزیان ئەنجامدا. لە ساڵی ١٩٩١دا گروپی پێشووی ئەوان واتە (سوپای سوور) بەرپرسیارێتی کوشتنی «دیتێلف رویدلێر» (Detlev Rohweddler) کە یەکێك لە ڕێبەرەکانی دەوڵەتی بنیاتنەرەوەی ئابووری ئەڵمانی ڕۆژهەڵات بوو، گرتە ئەستۆی خۆی. گروپی بریگادی سووری ئیتالیا توانی سەرۆك کۆماری پێشووی ئیتالیا بەناوی «ئالدۆمۆرۆ» بفرێنێ و دوایی لە ناوی بەرێت. هەروەها ئەم گروپە ژەنەراڵێکی ئەمەریکایی بەناوی «جەیمز دۆزیر» (James Dozier)یان فراند، بەلام ئەم ژەنەراڵە دواتر ڕزگاری بوو. سوپای ڕزگاری ئێرلەندا بۆ ماوەی چەند دەیەیەك درێژەی دا بە خەباتەکەی لە دژی دەستتێوەردانەکانی بەریتانیا لە کاروباری ئێرلەندای باکور، تا لە ئاکامدا ساڵی ١٩٩٥ ڕێکەوتننامەیەکی ئاگربەست لە نێوان دوو لایەنەکە واژوو کرا.

## تیرۆریستەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا

ئەگەرچی بەدرێژایی ڕۆژگار کۆمەڵێك کردەوەی تیرۆریستی بەرچاو ڕوویداوە، بەڵام هەندێك لە بەرچاوترینیان لە ئەوروپا ئەنجام دراون. زۆربەی تیرۆریستەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بەچەند گروپێکی تاڕادەیەك بچووك بەستراونەتەوە، کە بیرهێنەرەوەی ئانارشیستەکانی سەدەی نۆزدەن. ئەو گروپانە لایەنگری جۆرێك لە فەلسەفەی شۆڕشگێڕانەن و خویان بۆ ڕووخاندنی حکومەت و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان تەرخانکردووە. سەیر ئەوەیە ئەم جۆرە گروپانە هیچ



سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ڕوون پێشکەش ناکەن بۆ ئەوەی لە جێگای سیستەمە بەکاربەرەکەی دابنێن. سوپای کاتیی کۆماریخوازی ئێرلەندا و گروپی سووری ئەڵمان و بریگادە سوورەکانی ئیتالیا نموونەی ئەو جۆرە گروپانەن. پلەی ڕێکخراوەیی ئەم جۆرە گروپانە لە یەکدی جیاوازە، بەڵام دەتوانن بەتەواوی مانا پێشکەتوو و ئالۆزبن. هەموو ئەو گروپانە دەوڵەت و نوێنەرەکانی و هێماکانی دیکە سیستەمی ئێستا دەدەنە بەر پەلامارەکانیان و ئەمەش لە بارودۆخێکدایە زۆربەی ئەوانە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ناتۆ وەك نوێنەری ئیمپریالیزم دەدەنە بەر هێرش. بە پێچەوانەوە گروپە تیرۆریستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەمەریکای لاتین کە ئەندامەکانیان لە چینە نزمەکانی کۆمەڵگا دابین دەکەن، ئەندامانی گروپە تیرۆریستییەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا سەر بە چینی مام ناوەندی و زۆربەیان خوێندەوارن.

## نیشتمان و ئازادی باسك

ئەم گروپە کە بە سووکە ناوی ئیتا (Eta) بەناوبانگە ساڵی ١٩٥٩ لە ویلایەتەکانی باسکی ئیسپانیا و باسکی فەرەنسا دامەزراوە، نزیکەی ٢٠٠ ئەندامی هەیە. ئەو باوەڕە لە ئارادایە کە ئەم گروپە کۆنترین و لە هەمان کاتیش لە کردەوەکانیدا توندوتیژترین گروپی تیرۆریستی ئەوروپای ڕۆژئاوایە. ڕێبەرایەتی ئەو گروپە لە ئەستۆی خۆزێ ئانتۆنیۆ ئیچی- بێنگۆ ئیچی Jose Antonio Urruticoechea - Bengooechea (Jose Tern Era) (خۆزێ تیرێزە) دایە.

هیچ دەوڵەتێک وەکو پشتیوانی ئیتا نەناسراوە. ئەم ڕێکخراوە دەیەوێ بە پەنابردنە بەر تیرۆریزم لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئیسپانیا دەوڵەتێکی سەربەخۆی مارکسیستی (Euzkadi) لە باسک دابمەزرێنێ. جگە لەمەش ئەم گروپە هەوڵ دەدات لە ڕێگەی ترساندنی بازرگان و چالاکی ئابووری لە ویلایەتەکانی باسکی ئیسپانیا و باسکی فەرەنسا قەیرانێکی ئابووری لەو ناوچەیە دروست بکات، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسپانیا و ئەندامانی هێزی ئاسایشی و سەربازییەکان دەداتە بەر پەلامارەکانی و لە هەمان کاتیشدا ئەم گروپە کۆمەڵێک تەقینەوەی جۆرا و جۆری لە دژی دامەزراوە دەوڵەتی و شوێنە گەشتوگوزارییەکان ئەنجام داوە.

ئەم گروپە لە ڕێگای مرۆڤڕفێنی و دزی چەکدارانە و فێڵ و تەڵەکە، کە خۆی ناوی ناوە «باجی شۆڕشگێڕانە»، پارەی پێویست بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانی دابین دەکات و لە ڕێگای دزی لە بانک و کۆمەڵێک باجگیری گەورە چەندین ملیۆن دۆلاری کۆکردۆتەوە.

پێکهاتەی ڕێکخستنی ئیتا بە تەواوی مانا ئاڵۆز و پێشکەوتووە. زۆربەی ئەندامەکان (کۆماندۆز)ی ئەم گروپە لە کۆمەڵێک دەستەی نهێنی ٣ یان ٤ کەسیدا ڕێکخراون و هەموویان ژیانی یاساییان هەیە، واتە زۆربەیان لە لایەن پۆلیسەوە نەناسراون و هەر ئەم هۆکارەشە توانای ئەوەیان پێدەدات، بێ ئەوەی گومانیان لێبکرێت بە ئاشکرا بژین. ئەم ئەندامانە دوای تەواوکردنی چالاکییەکانیان دەگەڕێنەوە شوێنەکانیان و دەڵێی سەرلەنوێ ون دەبنەوە.



گروپێکی پشتیوانی مەزنیش هەیە کە بۆ پاراستنی ژێرخانی ئەم گروپە پەیوەندی و زانیاری و پشتیوانی دیکەش دابین دەکات. بەڵام پەیوەندی بەرفراوانیشی هەیە لەگەڵ گروپەکانی دیکە. ئەم پەیوەندییانە خۆی لە هاوکاری و پەیوەندی لەگەڵ سوپای کایتی کۆماریخوازی ئێرلەندا و هەروەها کۆمەڵێک پەیوەندی دیکە لەگەڵ دەوڵەتی کوبا دەبینێتەوە، کە حەشارگەی ئەمن و ڕاهێنانی پێویست بۆ ئەندامەکانی ئەم گروپە دابین دەکات. هەروەها چەند بەڵگەیەک لەبەر دەستدایە کە دەریدەخات ئەندامانی ئیتا لە پاراگوای دەستیان هەبووە لەو هێرشانەدا کە کراونەتە سەر ساندینیستەکان[*].

## تیرۆریستەکانی ئەمەریکای لاتین

ئەمەریکای لاتین لە دوو سەدەی ڕابردوودا سەقامگیری سیاسی بەخۆوە نەبینیوە[١٥]. سیاسەت لە ئەمریکای لاتیندا لە کەش و هەوایەکی لە ڕادەبەدەر دەڕواتە پێشی و ڕووخساری دیاری ئەو سیاسەتە بریتی بوو لە کودەتای سەربازی یەک لە دوای یەک و دەسەڵاتداری ڕژێمگەلێکی زۆر سەرکوتکەر لە دەوڵەتانی وەک گواتیمالا، سلڤادۆر، شیلی، ئەرژەنتین و نیکارگوا بەر لە شۆڕشی ساندینستی لە ساڵی ١٩٧٩. کردە تیرۆریستیەکان لە ئەمەریکای لاتین بەزۆری نیشانەی ڕوودانی کۆمەڵێک شەڕی بەتەواوی مانا پارتیزانییە. زۆربەی ئەو کردەوانە بۆ ئەوە ئەنجام دەدرێن، تا نیشان بدەن گروپەکان هێشتاش بەهەڕەشەیی ماونەتەوە. هەر وەکو پێشتر وتمان، قاچاغی ماددە سڕکەرەکان، مامەڵە لەت و پەتەکانی نێوان قاچاغچیانی ئەو ماددانە گروپە تیرۆریستیەکانی دوو هێندەی

خۆیان گەورە کردن و ئەو چالاکییەی سازداوە کە بەتیرۆریزمی مادده سڕکەرەکان بەناوبانگە. تیرۆریزمی ئەمەریکای لاتین ساڵانێکی زۆر لەم رووەوە کە هەرەشەی لە هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکرد، جیاوازی هەبوو لەگەڵ تیرۆریزمی رۆژهەڵاتی ناڤین و ئەوروپای رۆژهەڵات. بەڵام لە نیوەی دەیەی ١٩٨٠ بەدواوە ئەو بارودۆخە بەهۆی توندوتیژبوونی شەڕی کۆکایین لە نێوان دەوڵەتەکانی ئەمەریکای لاتین و قاچاغچییانی مادده سڕکەرەکان گۆڕانی بەسەرداهات.

هەرچەندە ژمارەی رێکخراوە تیرۆریستییەکانی ئەمەریکای لاتین زۆرە، بەڵام هەندێکیان بە درێژایی تەمەنیان ناوبانگی زیاتریان بەدەستهێناوە. بۆ وێنە، لە کاڵی کە دەکەوێتە کۆلۆمبیا، بزاڤی ١٩ی نیسان (ئێم - ١٩) بە نزیکەی هەزار ئەندامەوە لە کاتی دروست بوونییەوە لە ساڵی ١٩٧٥ بەم لاوە، لەدژی "بورژوازی" کۆلۆمبیا و ئیمپریالیزمی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستیکردووە بە خەبات. داگیرکاری، هێرشکردنە سەر شارو بنکە سەربازییەکان، تیرۆری ئەندامە پایەبەرزەکانی سوپا سەرجەم چالاکییەکانی ئەم گروپە پێکدەهێنێ. رفاندنی بازرگانە دەوڵەمەندەکان و فەرمانبەرانی کۆمپانیا بیانییەکان و رفاندنی فڕۆکە بۆ دابینکردنی پارەو پول یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی گروپی (ئێم - ١٩) یە. هەروەها ئەم گروپە لە رێگەی ئەو چالاکییانەی پەیوەندی بە مادده سڕکەرەکانەوە هەیە و بە زۆری لە رێگەی پارەوەرگرتن لە جوتیارانی گەڵای کۆکا و ماریجوانا لە کۆلۆمبیا بەشێکی دیکەی پارەی پێویستیان دابین دەکەن. یەکێك لەو رووداوە بەناوبانگانەی دەستی (ئێم - ١٩) ی تێدابوو بریتی بوو لە گرتنی کۆشکی دادگای شاری بۆگۆتا (Bogota ) و



بارمتەگرتنی ٥٠٠ کەس لە ساڵی ١٩٨٥، ٥٠ کەس لەو بارمتانە کە ١١ دادوەری دادگای باڵای کۆلۆمبیا تێدا بوون، کوژران.

هێزە چەکدارە شۆڕشگێڕەکانی کۆلۆمبیا بەناوی «فارك» یەکێکی دیکە لە گروپە مەزنە تیرۆریستییەکانی کۆلۆمبیایە. ئەم گروپە کە لە ساڵی ١٩٦٦ دامەزراوە ئەمڕۆکە بەیەکێك لەگەرەترین گروپە تیرۆریستییەکانی کۆلۆمبیا لەقەڵەم دەدرێت و بانگەشەی ئەوە دەکات ٤ تا ٥ هەزار ئەندامی هەیە. «فارك» خاوەن ستراتیژییەکی دوو پایەیە و چالاکییە تیرۆریستییەکانی لەگەڵ میکانیزمە سیاسییە شروعی و یاساییەکان تێکەڵ دەکات. «فارك» دەیەوێ حکومەتی ئێستای کۆلۆمبیا برووخێنێ و رژێمێکی چەپڕەو بهێنێتە سەرکار. «فارك»یش وەکو رێکخراوی «ئێم - ١٩» یەکێك لە رێکخراوە خاوەن ئەزموونەکانی گۆڕەپانی تیرۆریزمی مادده سڕکەرەکانە و، پەیوەندییەکی کاری نزیکی لەگەڵ قاچاغچییانی مادده سڕکەرەکان دروست کردووە. زۆربەی چالاکییەکانی ئەم گروپە لە ناوچەکانی چاندن و بەرهەمهێنانی مادە سڕکەرەکان خڕبوونەتەوە و لەو پارەیەی بە پشتیوانی دەستخستنی مادده سڕکەرەکان بەدەست دێت، چەك دابین دەکات.

هەروەك لە شوێنێکی دیکە ئاماژەمان پێکرد[١٦] رێگای درەوشاوەی پیرۆ سێیەمین گروپی تیرۆریستییە لە ئەمەریکای لاتین. رێگای درەوشاوەش وەکو رێکخراوی «فارك» مەزن و لە رادەبەدەر مەترسیدارە. ئەم رێکخراوە نزیکەی ٥ هەزار ئەندامی هەیە. لە ساڵی ١٩٩٢ بەو ئەنجامە گەیشتن کە ئەندامانی ئەم

گروپە لە خولێکی ٢٥ ساڵیدا بەرپرسیارێتی راستەوخۆی تیرۆری ٢٥ هەزار کەسیان لە ئەستۆدایە[١٧]. ئەم گروپە لە ساڵی ١٩٦٩ دامەزراوە و رێبەرایەتیکەی لە رێگەی ئابیمال گۆتێزمەنە (سەرۆك گۆنزالۆ) ( Presidente Gonzalo ) Abimael Guzman خەیاڵی ئەوەی لە سەردایە تا ساڵی ٢٠٠٠ لە رێگای شۆڕشێکی گوندییەوە حکومەتی یاسایی ئەو برووخێنێ و دواتر لە سووڕپێستە رەسەنەکان دەوڵەتێکی چەپڕەو دامەزرێنێ. بەدەستهێنانی پارەو پوڵ لە رێگەی برینی بانك و پرۆگرامی بەزۆر پارەوەرگرتن و فێڵبازی، کە بەزۆری وەکو وەرگرتنی "باجی شۆڕگێرانە"ی گروپی ئیتای باسك وایە، هەروەها کەڵك وەرگرتن لەو پارەیە بۆ ئەنجامدانی تیرۆری شاری و وەڕێخستنی شەڕی پارتیزانی گوندی، هونەری گروپی رێگای درەوشاوەیە.

دەوڵەتی پیرۆ لەگەڵ دەستبەسەرکردنی گۆتیزمەن لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٩٢ سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا. ئەگەرچی گومان دەکرا ئەم رێکخراوە ناتوانێ بەبێ رێبەرە پیرۆزەکەی درێژە بە چالاکییەکانی بدات، بەڵام بەڵگە و رووداوەکانی دوایی نیشانیدا، رێکخراوی رێگای درەوشاوە ئێستاکەش یەکێکە لە بەهێزترین رێکخراوە تیرۆریستییەکانی پیرۆ.



## ئەفسانەی گۆتیزمەن

یەکەمین وێنەکانی گۆتیزمەن کە دوای گیرانی بڵاوبونەوە هەمووانی تووشی سەرسوڕمان کرد: پیاوێکی قەڵەو و عەینەکی، فەرمانی ئەو پۆلیسەی کە دەیوت جلەکانت لەبەر بکە بێ ئەملاو ئەولا جێبەجێی دەکرد. ئایا ئەم خەپە گێژ و وێژەی کە بۆ دوایین جار لە ساڵی ١٩٧٩ بینرابوو بەڕاستی دەیتوانی چرای رووناکی رێگای درەوشاوە بێت؟ ئەو پیاوێکی نهێنی ئامێز بوو کە دوای مارکس و لینین و مائو خۆی بە "شمشێری چوارەم"ی کۆمۆنیزم دەزانی. گۆتیزمەن بەناوی خوازەی چریکی "سەرۆك گۆنزالۆ" خۆی وەکو نیمچە خودای بزاڤێکی سیاسی لێ کردبوو کە لە قەشە ئایینیەکان دەچوو. ئەو تیشکە ئەفسانەییەی کە شکۆمەندی و گەورەیی و نەبەزیوی گۆتیزمەنی گرتبۆوە، نەیدەهێشت هاوڕێکانی ئەو لەگەڵ کەسە ئاساییەکان بەراورد بکەن، رەنگە خەڵکی ئەمەریکای لاتین گیڤارا بە نموونەی چریکێك بزانن، بەڵام گۆتیزمەن ئەوی وەك کەسێکی لەخۆبایی رەتدکردەوە، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە گیڤارا وەکو گۆتیزمەن لەسەرخۆ نەبوو لە کوشتاری ژنان و منداڵانی بێ تاوان.

هەرچەند دڕندەیی ئەم تیرۆریستە پیرۆییە جێگەی شك و گومان نیە، بەڵام رەنگە ئەو ئەفسانە درۆییانەی لە بارەی ئەوەوە وتوویانە بەر لەوەی نیشانەی کەسایەتی ئەو بێ، پتر روونکەرەوەی خەیاڵی ئەو خەڵکە چارەڕەشانەیە کە دەیپەرستن. وەکو شۆڕشگێڕێکی فەیلەسوف رێز لە گۆتیزمەن دەگرن، بەڵام ئەو پتر بەپێزترین نووسینەکانی ماوی بەبێ شەرمیەوە دزیوە. ئەگەر چی وا دێتە بەرچاو گۆتیزمەن

کە وەك شۆڕشگێڕێك لە بابەتی دەرکردنی ناشیرینترین فەرمانە دڕندەکان هەرگیز تووشی ئازاری ویژدان نەبێ، بەڵام کەس نازانێ ئایا خودی ئەو کەسی کوشتوە یان نەیکشتووە. ئابیماڵی لاو، منداڵی ناشەرعی ژنی پیاوێکی پارێزگای ئارکیپا (Arequipq) بوو، کە نە بنەماڵەی دایکی و نە بنەماڵەی باوکی (بازرگانێکی چینی مام ناوەندی بوو) ئەویان قەبوڵ نەکرد. ئاشناو دۆستەکانی، ئەویان وەك کوڕێك دەهاتە بیر کە هەمیشە سەرقاڵی خوێندنەوە بوو. لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا لەلایەن ئەو پۆلیسانەی خەریکی شکاندنی مانگرتنێك بوون دارکاری کرا، لە سەردەمی خوێندکاریدا کەوتە ژێر دەستی فەیلەسوفێکی کۆمۆنیست و وێنەکێشێك کە ستالینی وەکو شۆڕشگێڕێکی بەتەواو مانا نەدەهاتە بەرچاو. گۆتیزمەن لە ساڵی **١٩٦٢** لە زانکۆی هوامانگا (Huamanga) لە ویلایەتی ئایاکوچۆ (Ayacucho) خەریکی وتنەوەی وانەی فەلسەفە بوو و سوودی وەرگرت لە پێگەی مامۆستایەتی خۆی بۆ گەیاندنی هزرەکانی، بە مێشکی خوێندکاران. شۆڕشی کولتووری مائو کە گۆتیزمەنیش ئەزموونی کردبوو، کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر دانا. بە وتەی ڕۆژنامەوانێك بە ناوی گۆستاڤۆ گۆریتی (Gustavo Gorti) " ئەو باوەڕە سەریهەڵدا، گۆتیزمەن نە تەنیا ڕێبەرێکی شیاوە، بەڵکو بەرپرسیارییەکی نەتەوەیی و جیهانی لە ئەستۆیە " لێکۆڵەرەوان لەسەر تواناییەکانی گۆتیزمەن ناکۆکن، بەڵام هەموویان ئەو وەکو ڕێکخەرەوەیەکی بەرچاو دەناسن، کە سەرنجڕاکێشی و وردبینیەکی لە ڕادەبەدەری هەیە. گۆتیزمەن بەر لە گیرانی بەژێرییەوە کۆمەڵێك پڕوپاگەندەی وەرێخستبوو، وا هەست پێدەکرا ڕێگای دەرەوشاوە لە هەموو شوێنێك ئامادەیە. دڵنیانەبوون لە



مان و نەمانی گۆتیزمەن گەورەیی و شکۆمەندی ئەوی پتر دەکرد. بەڵام ئێستا کە زیندووبوونی سەلمێنداروە، هەموو کاربەدەستان هەوڵدەدەن بەزیندوویی ڕایگرن، خراپترین شت بۆ ئەوان بوونی گۆتیزمەنێکی مردوو یان شەهیدە**.

### تاوانە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان

ولیام چەمبلیس (William Chambliss) سەرۆکی ئەنجوومەنی تاوانناسیی ئەمەریکی (American society of chiminology) لە وتارە سەرەتاییەکانی خۆیدا هاوکات لەگەڵ باسکردنی پرسی «تاوانە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان» ( state organized chimes) ئەم تاوانەی بەم شێوەیە پێناسە کردووە: «ئەو کارانەی کە یاساوڵ و کاربەدەستە دەوڵەتی و حکوومییەکان هاوکات لەگەڵ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان لە پلەی نوێنەرایەتی دەوڵەتدا ئەنجامی دەدەن»[١٨]. بە باوەڕی چەمبلیس، دەوڵەتەکان زۆربەی کات بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەیان خەریکی قاچاغی چەك و ماددە سڕکەرەکان و یەکگرتوویی لە پێناو مرۆڤ کوژی و کردەی تیرۆریستی و تاوانەکانی ترن. سەرەڕای نایاساییبوونی ئەم کردەوانە، دەتوانین لە ڕوانگەی بەرژەوەندییە ڕاستەوخۆ و خێراکانیان چاوی لێبکەین، بەڵام ئەم کردەوانە زۆربەی کات ئاکام و لق و پۆپی چاوەڕواننەکراو و نەخوازراوی لێدەکەوێتەوە، کە جاری واهەیە لە دامودەزگا هەواڵگرییەکان شاپی ئۆپێراسیۆنی (blowback) پێدەوترێت. لە بەشی ئێستادا باس لە بابەتی ئەم تاوان و دەرئەنجامە نەخوازراوانە دەکەین کە دامودەزگاکانی بەڕێوەبەری یاسای

ناچار کردووە بەرەنگاریان بێتەوە. کاتێك دەوڵەتان کردەوەگەلێکی نایاسایی بەپێی یاساکانی خۆیان ئەنجام دەدەن یان کاتێك دەسەڵاتدارە دەوڵەتییەکان لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان یاساغی دەکەن، لەم حاڵەتدا تووشی تاوانی ڕێکخراوی دەوڵەتی دەبن[١٩]. هەرچەند دەواەتەکان بەدەگمەن تاوانبار بوونی خۆیان ئاشکرا دەکەن یان کردەوە نایاساییەکانی خۆیان دەشارنەوە، بەڵام هەم لە ڕوانگەی دیرۆکەوە و هەم بەچاوخشاندنێك بەسەر ڕووداوە نوێیەکان دەردەکەوێ کە تاوانە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی لە چالاکییە نهێنییەکانی ئاژانسە هەواڵگرییەکان دەبینرێن. هەر هەوڵ و چالاکییەکی دەوڵەت کە بۆ ماوەیەك لە دیدی گشتی و چاودێری پەرلەمان بەنهێنی دەمێننەوە، بەناچارییەوە لە بواری پشتیوانی و دابینکردنی دارایی بە چالاکییە تاوانکارییەکان دەبەسترێتەوە. نهێنی بوونی چالاکییەکان تەنیا لەبەرئەوەی کە چالاکییەکی نهێنییە و بە مۆلەتی دەوڵەت ئەنجام دەدرێ، هەموو بارودۆخ و زەمینەیەك بۆ ئەنجامدانی کردەوەی تاوانکارییانەی ڕێکخراو دەرەخسێنی[٢٠]. چالاکییە هەواڵگرییە نهێنییەکان بەشێوەی ئاسایی ناکەونە ژێر لێکۆڵینەوەی وردو چاودێری بەڕێوبەرانی یاسا. لە ڕێگای کەناڵە فەرمییەکانەوە دەتوانرێ پەڕینەوە لە گومرگ ئاسان بکرێت. بۆ ئەنجامدانی چالاکییە نهێنییەکان، سوود لە شێوازە باوەکانی ژمێریاری دارایی، وەرناگرن. بە بیانووی پێوەندی بابەتەکە بە «ئاسایشی نەتەوەیی» دەتوانرێ لێکۆڵینەوەی دەزگاکانی بەڕێوەبەری یاسا لە سەر ڕێگای ئاسایی خۆی لابرێت. لە ئاکامدا ڕێکخەرەکانی ئەم جۆرە کردەوانە، کەسانێکی خاوەن ئەزموون و شارەزا کە زۆربەیان تاوانبارێکی پسپۆڕن بۆ



ئەنجامدانی ئەرکە پێسپێردراوەکانیان بەکرێ دەگرن، چالاکییە نهێنیەکان بەهاوکاری تۆڕە تاوانکارییە ژێر زەمینیە ڕیشەداکوتاوەکان ئەنجامدەدرێن و ئەو دەوڵەتەی پاڵپشتی چالاکییەکانە، بەلانی کەمەوە چالاکییەکانی تاوانبارە هاوپەیمانەکانی لە ڕێکخراوە تاوانبارییەکان قەبووڵ دەکات و زۆربەی کاتیش خۆی دەستی لەو کردەوانەدا هەیە.

لەم ساڵانەی دواییدا ئاژانسە هەواڵگرییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەوڵیانداوە یارمەتی لە قاچاغچیانی ماددە سڕکەرەکان وەرگرن و توانیویشیانە ئەو هاوکارییە بەدەستبهێنن. هەرچەند بەدڵنیاییەوە ئەمە ئەوپەڕی دووڕووییە، دەوڵەتێك لەلایەکەوە لە ڕێگای هاوڵاتییەکانەوە بەرەنگاری قاچاغچیان بێتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە بیهەوێ پاڵپشتی قاچاغچیانی ماددە سڕکەرەکان بەدەستبهێنێ، بەڵام ئەم شتەش زۆر سەیروسەمەرە نییە. هەرچییەك بێت هەر وەك چەمبلیس دەڵێ: قاچاغی سەرکەوتووانەی ماددە سڕکەرەکان هەمان ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە کە بۆ سەرکەوتنی چالاکییە سیخوڕی و هەواڵگرییەکان پێویستە[٢١]. هەردوو جۆری ئەم چالاکییانە پێویستی بەئاڵوگۆڕی نهێنی خێرای قەوارەیەکی مەزن لە کەلوپەل و پارە و بەستەی پۆستی هەیە. ئەو کەسانەی بۆ ئەنجامدانی کردەوە نهێنی و نایاساییەکان بەکرێ دەگیرێن دەبێ خاوەن هێزی تێگەیشتن و وەفاداری زۆربن" و بۆ گرێنتیکردنی ئاسایشی چالاکییەکان لە هێزو دڕندەیی کەڵك وەردەگیردرێت.

## تیرۆریزمی دەوڵەتی و سیاسەتی دەرەوەی

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

ڕێکخراوی ((سی ئای ئەی)) بۆ لەناوبردنی سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێردراوی دیموکراتی ئێران واتە دوکتور محەمەدی موسەدیق لە ساڵی ١٩٥٣ دا پیلانێکی ناشیرین و گەورەی گێڕا[٢٢]. موسەدەق دوای گەیشتن بە پۆستی سەرۆك وەزیران، چەند کۆمپانیایەکی بیانی نەوتی خۆماڵی کرد. دەوڵەتی دکتۆر موسەدەق پێشنیاری پێدانی غەرامەی بە کۆمپانیا نەوتییەکان کردبوو، بەڵام ئایزنهاوەر سەربەخۆیخوازی ڕێبەرە دەرەکییەکانی قەبووڵ نەدەکرد و بۆ لەناوبردنی حکوومەتی موسەدەق و دانانی ڕژێمێکی پاشایەتی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی دەستی بەزنجیرەیەك چالاکی کرد. شا لە بەرامبەر پاڵپشتی ئەمریکا لە کۆدێتا بەڵێنی دا زیاتر لە ٥٠٪ بەرهەمی نەوتی ئێران بخاتە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمەریکا. ((سی ئای ئەی)) دوای ڕووخانی دەوڵەتی خەڵکسالاری موسەدەق و بەدەسەڵات گەیشتنی شا، یارمەتی دەوڵەتی شای لە دامەزراندن، ڕاهێنان و پشتیوانی دارایی لە ساواك (پۆلیسی نهێنی و خراپکاری و وەفاداری شا). ساواك لە ٥ ی ساڵی ١٩٥٢ نزیکەی ٦ هەزار هاوڵاتی ئێرانی لە ڕۆژێکدا کوشت[٢٣]. لە بەندیخانەکاندا ئەشکەنجە باوبوو و ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی ڕایگەیاند کە ((فایلی ئێران لە بواری مافی مرۆڤ لە فایلی هەموو دەوڵەتەکانی جیهان ڕەشترە))[٢٤].



هەرچەند کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمەریکا و بازرگانەکانی چەکی ئەم دەوڵەتە سوودیان لە حکوومەتی شا وەردەگرت( ئێران بەبڕی ١٧ ملیون دۆلار کەلوپەلی سەربازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کڕی)، بەڵام بۆ بەراوردکردنی خەرجی کۆتایی کۆدێتاکە، دەبێ سەرنج بدەینە کاریگەری شۆڕشی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٧٩ کە بووە هۆی ڕووخانی ڕژێمی شا. دەوڵەتی شۆڕشگێڕی ئێران سیاسەتێکی بەتەواوی مانا دژە ئەمریکایی گرتەبەرو ئەمەش زۆر بە زیانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەواو بوو.

### گوتیمالا

((سی ئای ئەی)) کە بەهۆی سەرکەوتنی لە ڕووخاندنی حکوومەتی دکتۆر موسەدەق سەرخۆش ببوو، ساڵی دواتر دەستی لە کاروباری ناوخۆیی گوتیمالا وەردا. ((سی ئای ئەی)) ساڵی ١٩٥٤ کۆدێتایەکی سەربازی وەرێخست و توانی ڕێبەری گوتیمالا بەناوی جاکوب ئاربێنز (Jacobo Arbenz) کە بەشێوەیەکی دیموکراتیانە هەڵبژێردرابوو، لە پۆستی دەسەڵات بهێنێتە خوارێ[٢٥]. ئاربێنز پێبەندی دیموکراسی بوو و لە هەڵبژاردنەکانی گوتیمالا ٦٥٪ دەنگەکانی بەدەستهێنابوو بەڵام تاوانی ئەو پشتیوانیکردنی بوو لە چاکسازی زەویەکان. گوتیمالا وڵاتێك بوو کە ٣٪ خاوەن زەوییەکانی خاوەن ٧٠٪ زەوی جووتیارییەکان بوون. ئاربێنز دوای گەیشتن بەدەسەڵات، ١,٥ ملیۆن جەریبی لە زەوی و زارە جووتیارییەکان، بۆ وێنە زەوی و زارەکانی کۆمپانیای یۆنایتید

فرۆتی (United fruit company) ئەمەریکای خۆماڵی کرد. کۆمپانیای ناوبراو بەردەوام داوای لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکرد لەدژی ئاربێنز بجولێتەوە و لە سەر ئەم بنەمایەش «سی ئای ئەی» یارمەتی دارایی پێشکەش بە سوپایەکی یاخیبووی لە هیندۆراس دەکرد. لە ٨ ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٤ ئاربێنز هەڵات. دیکتاتۆری دەستنیشانکراوی ئەمەریکا کە دوای ئاربێنز دەسەڵاتی گرتەدەست خێرا بەرنامە چاکسازییەکانی ئاربێنزی لە بواری زەوی و زار هەڵوەشاندەوە، پرۆگرامەکانی فێرکردنی خوێندنی راگرت، مامۆستاکانی دەرکرد، فەرمانی دا کتێبە «رووخێنەرەکان» بسووتێنن و یارمەتیی لە جووتیارە گوندنیشنەکان بڕی. دوای ئەوە گوتیمالا بەدرێژایی سی ساڵ لە ژێر فەرمانی دیکتاتۆرێکی سەربازی بەدناو دابوو، کە بەسەر هاووڵاتیانی ئەم دەوڵەتەیدا سەپێنرابوو و هێزە سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پشتوانییان لێدەکرد.

## کوبا

لە ساڵی ١٩٥٩ دا فیدل کاسترۆ (Fidl castro)، دیکتاتۆری پێشووی کوبای بە ناوی فول ژنیسیا باتیستا (Fulgencia Batista) رووخاند. باتیستا پێوەندیەکی دۆستانەی هەبوو لەگەڵ کۆمپانیا ئەمەریکییەکان و ئەو گروپانەی دەستیان هەبوو لە تاوانە رێکخراوەکانی وەکو بەڕێوەبردنی قومارخانە گەورەکان، سۆزانیخانەکان و قاچاغی مادده سڕکەرەکان لە دەرەوەی هاڤانا[٢٦]. ئەمجارەشیان



دەوڵەتی ئایزنهاوەر بڕیاری دا بۆ چارەسەرکردنی گرفتی رووخاندنی کاسترۆ کەڵك لە «سی ئای ئەی» وەرگرێ. «سی ئای ئەی» لە هەنگاوی یەکەمدا هەوڵی دا لە چوارچێوەی ئۆپراسیۆنێك لە ژێر ناوی «ئۆپراسیۆنی ٤٠» (Opreration 40) دەرکراوە کوبابییەکانی دژی کاسترو فێری تاکتیکە تیرۆیستییەکان بکات. هێرشی تیرۆریستی لە دژی کوبا، هەوڵ بۆ تیرۆری رێبەرانی کوبا و یەکگرتن و هاوکاری لەگەڵ سیما ناسراوەکانی تاوانە رێکخراوەکانی، واتە سام جیانکا ( am Giancana) و سانتۆ ترافکانتیێ (Santo Trafficante) و جانی رۆستیلی (Janhany Roselli) لە پێناو تیرۆری خودی کاسترۆ سەرجەم بەرنامەکانی ئۆپراسیۆنی ٤٠ پێك دەهێنا.

دەرکراوەکانی کوبا کە لە لایەن «سی ئای ئەی» یەوە پەروەردەو راهاتبوون لە نیسانی ساڵی ١٩٦١ لە کەنداوی بەرازەکانەوە (Bay Of pigs) دەستیان بە هێرشکردن کرد. ئەم ئۆپراسیۆنە کارەساتێکی سەربازی لێکەوتەوە و زۆربەی هێزە سەربازییە هێرشبەرەکان کوژران یان دەستەبەسەرکران. نوشوستهێنانی هێرش بۆ کەنداوی بەرازەکان، بووە هۆی گۆڕانکاری لە تاکتیکەکان لەدژی کوبا. ئۆپراسیۆنی «JM,Wave» شوێنی ئۆپراسیۆنی ٤٠ ی گرتەوە. لەم ئۆپراسیۆنە نوێیەدا نزیکەی ٣٠٠ ئەندامی «سی ئای ئەی» و ٤ تا ٦ هەزار دەرکراوی کوبایی لە زنجیرەیەك هێرشی تیرۆریستی لەدژی کوبا هەوڵیان دا کۆمپانیاو پاڵاوگەکانی نەوت و شەکر وێران بکەن. جگە لەمە ئۆپراسیۆنی کوشت و کوشتاریش لە چوارچێوەی ئۆپراسیۆنی ٤٠ دەستی پێکردبوو و هەر درێژەی هەبوو.

له ساڵی ١٩٦٥ له ئاكامی ئاشكرابوونی ئەو ڕاستییەی كه فرۆكەكانی ئۆپراسیۆنی ((JM,Wave)) بۆ قاچاغی مادده سڕكەرەكان بەكار دەهێنرێن ئەم ئۆپراسیۆنه ناوبراوه، ڕاگیراوه ئەو هەزاران كوباییه دەركراوەی كه به تەواوی مانا پەروەردە و ڕاهێنرابوون و له بواری سیاسەتدا دوانگەی كۆنەپەرستانەیان هەبوو له ناو وڵاته یەكگرتووەكان بەرەڵاكران، ئاكامه خراپ و نەخوازراوەكانی ئۆپراسیۆنی ((JM,Wave)) جێگەی سەرنجن. ژمارەیەك لەو دەركراوه كوباییانه ڕوویان كرده كردەوەی تیرۆریستی و تەنیا له ساڵی ١٩٧٥ دا ٢٥ تا ٣٠ كردەوەی بۆمبڕێژی له بەشی "دید" (Dade)ی فلۆریدا ئەنجامدران و دیپلۆماتكاره كوباییەكان لەم لاو ئەولای جیهان تیرۆر كران[٢٧]. بەشداربوونی تری ئۆپراسیۆنی (JM,Wave) كه لەلایەن ((سی ئای ئەی)) یەوە فێری جۆرەكانی قاچاغی مادده سڕكەرەكان و بەكارهێنانی زەبروزەنگ ببوون، ڕوویان كرده ئەنجامدانی تاوانه ڕێكخراوەكان. له نیۆجێرسی و فلۆریدا ژمارەیەك سەندیكای مەزنی قوماربازیان دامەزراندو قاچاغی بەرفراوانی كۆكایین لەلایەن گرووپە ڕێكخراوه تاوانكارییه كوبایی و كۆلۆمبییەكان ڕێكخستنگەلێكی نهێنییان دامەزراند.



## شیلی

((سی ئای ئەی)) له ساڵی ١٩٧٢ دا وەك بەشێك له بەڵێنی گشتیی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەته یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بۆ بڵاوكردنەوەی دیموكراسی لەم لاو ئەو لای جیهان، بڕیاری ڕووخاندنی حكوومەتێكی دیكه كه بەشێوەیەكی دیموكراتیانه هەڵبژێردرابوو خسته ناو پڕۆگرامەكانی خۆی. ئەم جارەیان سەرۆك كۆماری هەڵبژێردراوی شیلی به ناوی سلڤادۆر ئالێندێ (Salvador Allonde) ئامانجی سەرەكییان بوو[٢٨] ئالێندێ له ساڵی ١٩٧٠ دا بوو به سەرۆك كۆماری شیلی. كۆمپانیای ئای تی ئەند تی (IT&T) كه سەرمایه گوزاریگەلێكی بەرفراوانی له بەشی كانزاكانی شیلی كردبوو، لەگەڵ ((سی ئای ئەی)) دەستبەجێ دوای هەڵبژاردنی ئالێندی دەستیانكردەوە به چالاكی بۆ ناسەقامگیركردنی ئابووری و هەوڵیاندا حكومەتی ئالێندی بڕوخێنن. ((سی ئای ئەی)) ساڵی ١٩٧٢ تاكتیكەكەی گۆڕی بۆ ڕووخاندنی ئالێندی و، لەگەڵ هێزه سەربازییەكانی شیلی هاوكاری كرد.

لەم كۆدێتایەدا ئالێندێ لەگەڵ ٣٠ هەزار كەس له هاووڵاتیان كوژران. ئەو پێكهاتەو دامەزراوه دیموكراتیانەی كه ئالێندێ دروستی كردبوون لەلایەن كۆدێتاچییەكانەوه هەڵوەشێندرانەوه و ژێنراڵ پینۆشێ (Pinochet) كه خۆی به ئادۆلفۆ هیتلەری دووەم دەزانی، ڕژێمێكی سەركوتكەری بی وێنەی بەسەر شیلیدا سەپاند. ڕژێمی پینۆشێ پتر له هەزار كەسی بەندكرد و ٢٠ هەزار كەسی تریشی كوشت.

## ئۆپراسیۆنی کۆندۆر

«سی ئای ئەی» لە یەکێك لە کاولکارییانەترین نموونەکانی تاوانی ڕێکخراوی دەوڵەتی کە دەستی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای تێدا بوو، لەگەڵ دەزگا پۆلیسییە نهێنییەکانی شەش دەوڵەتی ئەمەریکای لاتین پیلانی ناسین و دۆزینەوە و کوشتاری نەیارە سیاسیەکانی لەم دەوڵەتانە گێڕا. پۆلیسی نهێنی بینۆشی بە ناوی دینا (Dina) هەماهەنگسازیی ئەم خەباتە تیرۆریستیەی لە ئەستۆ بوو، بەڵام دەوڵەتانی ئەرژەنتین، بۆلیڤیا، بەرازیل، پاراگوای و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش بەشداربوون. لە ڕەوتی "ئۆپێراسیۆنی کۆندۆر" (Operation Condor) سەدان کەس ڕفێندران و کوژران[٢٩].

## بەشداری ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەمەریکا لە تاوانە ڕێکخراوەکاندا

بەلانی کەمەوە لە شەڕی دووەمی جیهانی بەم لاوە دەتوانین پێوەندییە توندوتۆڵەکانی نێوان گروپە جۆراوجۆرەکانی ئەنجامدەری تاوانە ڕێکخراوەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بدۆزینەوە. بە درێژایی شەڕی ناوبراو بەڕێوەبەرایەتی زانیارییەکانی هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (Office of Naval Intelligence) داوای لە کەسە هەڵکەوتووەکانی تاوانە ڕێکخراوەکانی نیۆیۆرك بە ناوی مییێر لانسکی (Meyer Lansky)، ئالبێرت ئاناستازیا(Albert Anastasia)، لاکی لوچیانۆ (Luky Luciano) کرد تا لە ئۆپراسیۆنی دژە سیخوڕی لە کەنارەکانی نیۆیۆرك یارمەتی ئەو دەزگایە بدەن. بە



پێی هەندێك بانگەشە ئەم جۆرە هاوکارییانە لە سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی دروست بوون، ئەمەش کاتێك بوو، کە کاربەدەستە هەواڵگرییەکانی هێزی دەریایی داوایان لەم کەسە هەڵکەوتووە ژێر زەمینییانە (کە کۆنترۆڵی لەنگەرگاکانی نیۆیۆرکیان لەدەست دابوو) کرد، تا نەهێڵن ژێردەریاییە (غواصە) ئەڵمانی و بێگانەکان بێنە ناو ئەو ناوچەیە. ئەم کاربەدەستە ناوبراوانە لەو باوەڕەدابوون دەلاڵان و سۆزانییەکانی کەناراوی نیۆیۆرك دەتوانن، وەکو گروپێکی دژە سیخوری کاربکەن. ئەو پیاوەی کە بۆ ئەم مەبەستە داوای هاوکاریان لێ کرد ناوی لۆچیانۆ بوو. بەپێی ڕاپۆرتەکان لۆچیانۆ لە پێشگری لە خراپەکاری یان هەر کارێکی دیکە، کە دەیتوانی بە درێژایی شەڕ مەترسی ساز بکات، بۆ سەر میناو بەندەرەکانی نیۆیۆرك بەتەواوی مانا سەرکەوتوو بووە. ئەگەرچی لۆچیانۆ لە ساڵی ١٩٢٦ بەتۆمەتی ناچارکردنی ژنان بەخراپەکاری دەستبەسەر و مەحکووم کرابوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٤ بەخشرا و، لە بەرامبەر ئەو خزمەتانەی لە کاتی شەڕ و لە ناو بەندیخانە پێشکەشی کردبوو، سزاکەی بۆ دوورخستنەوەی هەمیشەیی کەم بۆوە[٣٠].

## ئۆ. ئێس. ئێس لە ئیتالیاو مارسی

دەسەڵاتدارە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە ڕەوتی شەڕی دووەمی جیهانی لە هێرش بۆ سەر دوورگەی (سیسیل) سوودیان لە تاوانبارە ڕێکخراوەکان وەرگرت. سەندیکاکانی تاوانە ڕێکخراوەکانی نیۆیۆرك ئەندامانی خۆیان نارده ماڵی

ئیتالیاییە ڕەسەنەکانی دانیشتووی نیۆیۆرك و بۆ یارمەتیدانی هەواڵگری سەربازی، نامە، نەخشە، وێنەو کارتە پۆستاڵەکانیان کە تازە لە سیسیلەوە هاتبوون، کۆکردنەوە[٣١].

جگە لەمەش، ڤیتۆ ژینۆڤیس (Vito Gonovese) کە لە ئیتالیا و لەو تاراوگەیەی خۆی ویستبووی دەژی، بڕیاریدا هەردوو بەرەکە بخاتە گیانی میانڕەوەکان. لە ماڵێکدا ڤیتۆ بۆ ڕاکێشانی سەرنجی مۆسۆلینی پارەیەکی زۆری خەرج کردبوو، دەرفەتی قۆستەوە تا خۆی لە وڵاتە یەکگرتووەکان نزیك بکاتەوە. ژینۆڤیس دوای هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر ئیتالیا وەك «ڕاوێژکاری نافەرمیی حکوومەتی سەربازیی ئەمەریکا» کاری کرد[٣٢]. ئەو یارمەتی سوپای ئەمەریکایدا لە دۆزینەوەی ئەو سیاسەتمەدارە باوەڕپێکراوانەی هۆگری تاوانە ڕێکخراوەکان بوون لە ئیتالیا و بەدانانی ئەوان لە پۆستە فەرمییەکانی ئیتالیا قەڵغانێکی لە بەرامبەر پشتیوانی خەڵك لە پارتە سیاسییە سۆسیالیستەکان دروست کرد. ئەم هاوکارییە دوای کۆتایی شەڕ لە دەیەی ١٩٥٠ هەر درێژەی هەبوو، چونکە ئیتالیا پێیوابوو کۆمۆنیزم هەڕەشەیەکی نوێیە بۆ سەر ئەو. هەم گرووپە چالاکەکانی تاوانە ڕێکخراوەکان و هەم کاربەدەستانی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هاوکاری ژرینۆڤیس قازانجیان دەکرد. ئەو سیاسەتوانە ئیتالیانەی دژی سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان بوون، لە ڕێگای هاوکاری لەگەڵ تاوانبارە ڕێکخراوەکان دەسەڵاتەکەیان دەپاراست و بەم هۆیەشەوە دەوڵەتی ئیتالیا بەکردەوە نزیکەی ٤٠ ساڵ «مۆڵەتی ئەنجامدانی تاوان»ی دا بەتاوانبارە ڕێکخراوەکان.



دامودەزگا هەواڵگری و سیخوڕییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٥٠ جارێکی دیکە کەوتنە بیری وەدەستهێنانی یارمەتی و هاوکاری سیما چالاکەکانی تاوانە ڕێکخراوەکان، هەڵبەت ئەمجارەیان لە فەرەنسا، فەرەنسا بۆ پێشگرتن لە سەربەخۆیی کۆلۆنییەکەی (ڤیتنام) تووشی شەڕ بوو. وێڕای ئەمە کرێکارە سۆسیالیسەکانی بەندەری مارسی لە بارکردنی کەلوپەلی سەربازی بۆ ناو ئەو پاپۆڕانەی دەچوونە ڤیتنام خۆیان دەپاراست. ئەم بارودۆخە سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لە دوو لاوە دەخستە مەترسییەوە: یەکەم، ئەگەر فەرەنسا لە ڤیتنام نەیتوانیبا لە بەرامبەر هۆشی منە (Hochi minh) و ڤیت منە (Viet minh) خۆڕاگری بکات ئەوە سیاسەتەکانی بۆ پێشگری لە کۆمۆنیزم تووشی گرفت دەبوو. دووهەم، خودی فەرەنساش وەك یەکێك لە هاوپەیمانەکانی ئەمەریکا لەلایەن هاوبەندی هەڵبژێرداوی سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان و لە ڕێگای حیزبی کۆمۆنیست بەسەر سەندیکا کرێکارییەکان دەکەوتە بە هەڕەشە. هێرشی بۆ سەر سەندیکای رووخێنەران لە فەرەنسا، کە یەکێك لە بەهێزترین سەندیکای چەپەکان بوو، ئەم دوو مەترسیەی نەهێشت. ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەگەڵ سەندیکای تاوانە ڕێکخراوەکانی دوورگەی کۆرس (Corse) کە بەتوندی لە بواری لەشفرۆشی و گەندەڵکاری و خراپەکاری چالاکییان دەنواند، پێوەندییان بەرقەرارکرد بۆ لەناوبردنی سەندیکاکانی رووخێنەران لە فەرەنسا داوای یارمەتیان لەوان کرد. خراپەکارانی دورگەی کۆرس بەدامەزراندنی دەستە و تاقمەکانی کوشتن، هێرشیان کردە سەر مانگرتووان و دەستیانکرد بە بەدڕەوشتی

و تەنانەت کوشتنی ڕێبەرانی سەندیکا. تا لە ئاکامدا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو سەندیکایە دەرەتانی دەستپێکردنەوەی شەڕیان بۆ فەرەنسا ڕەخساند، وێڕای ئەوە دەروازەیەکیان بۆ شەڕی دواتری خۆیان لە دەیەکانی دیکە دۆزییەوە، حەقدەستی گەنگێستێرەکانی کۆرس زۆر بەرچاو بوو. ئەوان مۆڵەتی ئەوەیان وەرگرت تا سوور لە مارسی وەك ناوەندێك بۆ بازرگانی هیرۆیین وەرگرن. بەم شێوەیە گروپە تاوانکارەکانی کۆرس نەتەنیا کاری نوێ و پڕ داهاتیان دۆزییەوە بەڵکو " پێوەندییەکی فەرەنسی" "بە ناوپیشیانساز دا کە ٢٥ ساڵ دواتر بەشی هەرە زۆری پێداویستیەکانی ئەمەریکایان لە بواری هیرۆیین دابین دەکرد[٣٣].

## سی ئای ئەی لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

پێوەندییەکانی نێوان ئاژانسە هەواڵگرییەکانی ئەمەریکا و قاچاغچیانی مادده سڕکەرەکان، بەلانی کەمەوە لە سەرەتاکانی دەیەمی ١٩٥٠ دروست بوون. سی ئای ئەی ڕاستەوخۆ پشتیوانی لە کۆمین تانگ (ناسیۆنالیستەکانی چین) و بڵاوەکەرانی تریاك لە تایلەند و بێرمێ دەکرد. بەڕواڵەت ئەم یارمەتییانە بەو هیوایە دەدرا، کە ڕۆژێك ئەم هێزە چەکدارە پەرش و بڵاو و بچوکانە هێرش بکەنە سەر چینی کۆمۆنیست. سی ئای ئەی بۆ پشتیوانی ئاسمانی لە بازرگانانی کۆمین تانگ، دوو کۆمپانیای گەورەی دامەزراندن: کۆمپانیای گواستنەوەی ئاسمانی مەدەنی (Civil Air Transport) و کۆمپانیای ئامادەکاری و دابینکردنی دەریایی (Sea Supply Corporation).

ئەم دوو کۆمپانیایە هاوکارییە سەربازییەکانیان دەگەیاندە ناسیۆنالیستەکانی چین و تریاکەکەیانی لە سێگۆشەی زێڕینەوە دەبردە تایلەند و تایوان. یارمەتییەکانی سی ئای ئەی بەو سەرکردە سەربازییانەی تریاکیان بڵاودەرکردەوە تا ڕێژەیەکی زۆر ڕۆڵی هەبوو لە بڵاوبوونەوەی سەرسوڕهێنەرانەی خووگرتن بەهێرۆیین لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دەیەی ١٩٦٠. لەو ڕێکەوتەدا ژمارەی بەکاربەرانی هیرۆیین لە ٦٥ هەزار کەسەوە بۆ ٥٠٠ هەزار کەس بەرز بۆوە[٣٤].

گەورەترین بازرگانی جیهانی تریاك بەناوی چانگ چی – (Chang Chi –fu) چەندین دەیەیە وەك "پاڵپشتیکراو "ی سی ئای ئەی کار دەکات. قەیسەرەکەی دیکەی سێگۆشەی زێڕین بەناوی لی وێن – هوان (Li Wen – huan) ڕاستەوخۆ یارمەتی سەربازی لە (سی ئای ئەیەوە) وەرگرتووە، سێهەمین قاچاغچی گرینگی هیرۆیین بەناوی لوهسۆ – شۆی (Lu Hsu- shui) بە فەرمانی ((سی ئای ئەی)) لە لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی بەرەنگاری لەدژی ماددە سڕکەرەکانی ئەمەریکا ( Prug Enfoncement Administration) ڕزگاری بوو[٣٥].

((سی ئای ئەی)) لە ڕەوتی شەڕی ڤێتنام سوپای یاخیبووانی لاوس کە لە ئەندامانی هۆزی هەمونگ (Hmong) (مییو) (Meo) پێکهاتبوو لە بواری هاوکاری خۆراکی و دارایی یارمەتی دان و پشتیوانی لێ کردن. ژەنەڕاڵ ڤانگ پاو (Vang pao) فەرماندەیی ئەم سوپا نهێنییە ٣٦ هەزار کەسییەی لە ئەستۆ بوو و ئامانجەکانی بریتیبوو لە بڕینی ئەو ڕێگایانەی یارمەتییەکانی ڤیتنامی



باکوری پێدا دەگوازرێتەوە بۆ شەڕکەرانی ڤیت کۆنگ (Viet Cong) لە ڤیتنامی باشور. سوپای وانگ پۆ بە سەرکردایەتی ئەفسەرە بەئەزموونەکانی سی ئای ئەی و بەتەواوی بەپارەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بواری کەلوپەلی خۆراکی، دارایی و کەلوپەلی سەربازی یارمەتی دەدرا. پرۆگرامی کوشت و کوشتاری ڕێبەرانی گوندەکان وەك بەشێك لەو یارمەتییانە بوو کە سوپای وانگ پۆ دەیدا بە ئاژانسە هەواڵگرییەکانی ئەمەریکا. ئەندامانی هۆزی وانگ پۆ لە مێژ ساڵ بوو خەریکی کشتوکاڵی خاشخاش بوون. شەڕ گرفتی بۆ ئەوان لە بواری بازرگانی تریاك دروست کرد و لەم ڕووەشەوە ((سی ئای ئەی)) بۆ گواستنەوەی تریاکەکەیان لە بەرزاییەکانی لاوسەوە بۆ بنکە سەربازییە گەورەکەی لە لانگ تیێنگ (Long Tieng) لە فڕۆکەکانی کۆمپانیای ئایر ئەمەریکا ( Air America) (خۆی خاوەنیان بوو) سوودی وەرگرت. وانگ پۆ لە لانگ تیێنگ کارگەیەکی مەزنی هێرۆیینی دامەزراندبوو. جۆن جی ئۆنیل (John J ONeill) بەڕێوەبەری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دووری سەر بە بەڕێوەبەرایەتی بەربەرەکانی لەگەڵ ماددە سڕکەرەکانی ئەمەریکا دەڵێ ((من هیچ گومانێکم لەوە نییە کە بۆ گواستنەوەی تریاك سوود لە فڕۆکەکانی کۆمپانیای ئایر ئەمەریکا وەرگیراوە))[٣٦].

بەشێك لە هێرۆیینەکانی لاوس بۆ ڤیتنامی باشور بارکراوە و لەوێ بەهێزەکانی ویلاتە یەکگرتووەکان فرۆشراوە، ٢٠٪ ی ئەم هێزانە کە گەڕانەوە بۆ نیشتمان خۆیان بە هێرۆیینەوە گرتبوو.

## سی ئای ئەی لە باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا

سی ئای ئەی لە دەیەی ١٩٨٠ ئۆپراسیۆنێکی بۆ پشتیوانی لە موجاهیدانی ئەفغانستان ئەنجامدا. موجاهیدانی ئەفغانستانیش وەکو «شەڕکەرانی رزگاری» لە نیگاراگوا خەرجی شەڕەکەیان لە قاچاغی مادده سڕکەرەکان کە تریاك بوو، دابین دەکرد. ڕێبەرانی موجاهیدان چاودێری کشتوکاڵی خاشخاشیان دەکرد و بەهاوکاری سی ئای ئەی کە بۆ گەیاندنی چەك و تەقەمەنی بۆ موجاهیدان، ڕێگای بازرگانی نوێیان کردبۆوە و مادده سڕکەرەکانیان دەخستە ناو بازاڕە جیهانییەکان. بەپێی ڕاپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا چەند ناوچەیەکی ئەفغانستان و پاکستان کە لەژێر دەستی موجاهیدان دابوون تا ساڵی ١٩٨٦ ببوون بە ناوەندی هەناردنی هێرۆیین بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا و، ئاکامی هەموو یارمەتیەکانی سی ئای ئەی بۆ شۆڕشگێرانی ئەفغانی ئەمە بوو.

## سی ئای ئەی و خاوێنکردنەوەی پارە و پول

## لە فلۆریدا و حەوزی کارانیب

هاوپەیمانانی سی ئای ئەی لە کارائیب کە یەکێك بوون لە ئەنجامدەرانی ئۆپراسیۆنی ناسەرکەوتووانەی کەنداوی بەرازەکان بوو، ڕۆڵێکی سەرەکییان لە ئۆپراسیۆنی بانکی کاستل (Castle Bank) لە فلۆریدا لە ئەستۆ بوو. ئەم بانکە



دامەزراوەیەك بوو بۆ خاوێنکردنەوەی پارەی بەدەست هاتوو لە تاوانی ڕێکخراوی قاچاغی مەوادی سڕکەر بوو. کۆلۆمبیەکانی بۆ خاوێنکردنەوەی پارەی بەدەست هاتوو لە بازرگانی کۆکایین کەڵکیان لە بانکی پێرێنی (Bank of Perrine) لە فلۆریدا کە پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکان هەبوو، وەردەگرت. «سی ئای ئەی» و تاوانبارە ڕێکخراوەکان ڕۆڵی سەرەکییان لە دامەزراندن و کاروباری کۆمپانیا داراییە جیهانییەکان (World Corporation Finance) هەبوو. ئەم کۆمپانیایەی فلۆریدا لە خاوێنکردنەوەی پارەی بەدەستهاتوو لە قاچاغی مادده سڕکەرەکان و پشتیوانی لە چالاکییە تیرۆریستەکان دەستی هەبوو[٣٧].

## بانکی نیوگان – هەند

زۆربەی ئەو پارەیەی لە هاوکاری سی ئای ئەی لەگەڵ قاچاغچیانی مادده سڕکەرەکانی سێگۆشەی زێڕین بەدەست دەهات لە لایەن بانکی نیوگان - هەند (Nugan Hand Bank)ی ئوسترالیا خاوێندەکرایەوە. تۆڕێك لە ئەفسەرە پایەبەرزە سەربازی و هەواڵگرییەکانی ئەمەریکا پەیوەندییان لەگەڵ بانکی نیوگان – هەند هەبوو، ئەم بانکە لەلایەن کۆمیسیۆنێکی لێکۆڵینەوەی ئوسترالیایی بە قاچاغی مادده سڕکەرەکان، قاچاغی چەك و تەقەمەنی، خاوێنکردنەوەی پارە و فێڵ و تەڵەکەبازی بەرفراوان تۆمەتبارکرابوو[٣٨]. جۆناتان کویتنی (Jonathan Kwitny) لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە سەر بانکی نیوگان-

هەند ئەم بانکەی بە خاوێنکردنەوەی چەندین ملیار دۆلار، دابینکردنی بازرگانی لە سێگۆشەی زێڕین لە بواری دارایی، فێڵ و تەڵەکە لە بواری باج و دزی، تۆمەتبار کردووە[39].

کاربەدەستە پایەبەرزەکانی ئەم بانکە «هێرۆیین» کێ بوون؟ سەرۆکی نیوگان — هەند، دەریاوانی خانەنیشینی ئەمەریکایی بەناوی ئێرڵ ئێف یێتز (Earl f.Yates) بوو. راوێژکاری یاسایی ئەم بانکە ویلیام کۆلبی (William Colby) بوو کە پێشتر سەرۆکی سی ئای ئەی بوو. راوێژکارەکانی ئەم بانکە بریتی بوون لە یاریدەدەری پێشووی سی ئای ئەی بەناوی واڵتێر مەکدۆناڵد (Walter Mc Donald)، راوێژکاری پێشووی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەی بەناوی گای پارکەر (Guy Parker) و یەکێك لە گەورەترین قاچاغچیانی ماددە سڕکەرەکان بەناوی ئاندری لوێ (Andreww Lowe).

## بانکی نێودەوڵەتیی متمانە و بازرگانی

پێوەندی نزیکی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کۆمەڵگای دارایی و تاوانبارە رێکخراوەکان لە چالاکییەکانی بانکی نێودەوڵەتیی متمانە و بازرگانی (Bank of Credit and Commerce International) دەردەکەوێ و لە هەموو شوێنێك باشتر روون دەبێتەوە[40]. بانکی نێودەوڵەتیی متمانە و بازرگانی حەوتەمین بانکی گەورەی تایبەتی بوو لە جیهان. ئەم بانکە پتر لە ٤٠٠ لقی چالاکی لە ٧٣ دەوڵەتی جیهان هەبوو. خاوێنکردنەوەی لانی کەم ١٤ ملیار



دۆلار بۆ کارتێلەکانی کۆکایینی کۆلۆمبیا، ئاسانکاری لە بواری مامەڵەکانی دارایی بۆ مانوئێل نۆریگا (Manuel Noriega)ی سەرۆك کۆماری پاناما و عەدنان قاشۆچی (Adnan Khashoggi) گەورە بازرگانی چەك و تەقەمەنی، ناردنی پارە بۆ قاچاغچیانی (Contha) چەك بۆ کڕینی چەکی نایاسایی، قاچاغی ماددە سڕکەرەکان و و یارمەتیدانی سەرۆکی فیلیپین بەناوی فێرنارد مارکۆس (Ferdinand Marcos) بۆ گواستنەوەی سامانەکەی (بەهۆی بەرتیل و گەندەڵی بەدەستهاتبوو) بۆ دەرەوەی فیلیپین وێنەیەك لە چالاکییە تاوانکارییە جۆراو جۆرەکانی ئەم بانکەیە.

وەزارەتی دادی ئەمەریکا سەرەڕای بەرفراوانی و قورسی تاوانەکانی بانکی نێودەوڵەتی متمانە و بازرگانی و رۆڵی سەرەکی ئەو بانکە لە قاچاغی ماددە سڕکەرەکان هیچ مەیلێکی بۆ لێکۆڵینەوەی لە بارەی چالاکییەکانی ئەو بانکە لە خۆی نیشانەدا. لە ڕاستیدا تەنانەت ٣ ساڵ بەر لە دەست پێکردنی لێکۆڵینەوەکانی وەزارەتی داد زانیاری تەواو لە سەر چالاکییەکانی ئەم بانکە لە بواری قاچاغ و کڕین و فرۆشتنی چەك و سامانە نایاساییەکانی ئەم بانکە لە ئەمەریکا لەبەر دەستدابوو. رەنگە خەمساردی بەڕێوەبەرانی یاسا لەم دەوڵەتە لەمەڕ دەستوەردان لە کاروباری دامەزراوە زەبەلاحەکان لە زەمینەی تاوانە رێکخراوەکان بگەڕێتەوە بۆ ژمارەی زۆری دۆستانی ئەم بانکە لە پۆستە بەرزەکانی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

## گروپە چالاکەکانی کوبا لە بواری تاوانە ڕێکخراوەکان

کاتێك فۆل ژێنسیا باتیستای دیکتاتۆری کوبا ساڵی **١٩٥٩** لەسەر دەستی فیدل کاسترۆ لەناوبرا، دەزگا هەواڵگرییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئۆپراسیۆنێکی شاراوەی بەرفراوانیان بۆ ڕووخاندنی کاسترۆ وەرێخست. دەوڵەتی ئەمەریکا بۆ یارمەتیدانی هێرشە سەربازی و تیرۆریستییەکان بۆ سەر کوبا کەڵکی لە هاوپەیمانەکانی پێشووی باتیستا وەرگرت. دەوڵەتی ئەمەریکا ئەو هاوپەیمانانەی لە نێوان پەنابەرە کوباییەکانی ناوخۆی ئەمەریکا و ئەندامانی باندە ڕێکخراوە تاوانکارییەکان هەڵبژارد. تاوانبارە ڕێکخراوەکان بەرژەوەندییەکی بەرچاویان لە کوبا هەبوو. ئەوان بەر لە ڕوودانی شۆڕش بە هاوکاری باتیستا هاڤانایان کردبووە ناوەندێکی مەزنی قوماربازی، لەشفرۆشی و قاچاغی ماددە سڕکەرەکان. دوای شۆڕش، سیما ناسراوەکانی تاوانە ڕێکخراوەکان، یان بەندکران، یان لە کوبا دەرکران و بەم شێوەیە ئەم باندانە بەبڕی چەندین ملیار دۆلار زیانیان بەرکەوت. لە سەرەتادا، «سی ئای ئەی» و نەیارە کوباییەکانی کاسترۆ و کۆمەڵێك خراپەکار و گێرەشێوێن لە داڕشتنی کۆمەڵێك گەڵاڵە بۆ هێرشی پەنابەرە کوباییەکانی بۆ سەر کوبا پێکەوە هاوکارییان دەکرد. سوپای نهێنی کە بۆ ئەم مەبەستە دامەزرا و ناوی (بریگادی ٢٥٠٦) (Brigade 2506) بوو لە ژێر کۆنترۆڵ و فەرماندەیی مانۆێل ئارتایم (Manual Artime) (یەکێك لە ڕێبەرە کوباییەکانی دژی کاسترۆ لە مەیامی بوو) دابوو. بریگادی **٢٥٠٦** ساڵی



**١٩٦٢** هێرشێکی کارەساتبارییان بردە سەر کەنداوی بەرازەکان. «سی ئای ئەی» و هاوپەیمانەکانی لەگەڵ هەرەسهێنان و بڵاوبوونەوەی هێزە هێرشبەرەکان بۆ لەرزۆککردنی کوبا پەنایان بردە بەر تاکتیکێکی دیکە. بەرهەڵستکارە کوباییەکانی دژی کاسترۆ لە چەندین چالاکی نهێنی دا دووبارە ڕێکخستنەوە و ئەنجامدانی کاری تیرۆریستی لە دژی کوبا سەرەکیترین ئامانجی ئەوان بوو. لە پاڵاوگەکانی شەکر و نەوت بۆمبیان داناو، بارەکانی شەکریان ژەهراوی کرد و بەهۆی هێرشی تیرۆریستی کارە ژێرخانەییەکانی کوبا شێوێندرا، بەڵام بەشداری ئاشکرای دۆستانی باتیستا و سیما ناسراوەکانی تاوانە ڕێکخراوەکان لەم چالاکییانە بووە هۆی ڕیسوایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەرەتاکانی دەیەی **١٩٧٠** و دوای کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەك بەچەند کیلۆگرام کۆکایین و هێرۆیینەوە کە لەلایەن نەیارە کوباییەکانی کاسترۆ کەڵکی لێوەردەگیرا، کردەوە تیرۆریستییەکان لە دژی کاسترۆ ڕاگیرا[٤١].

## ڕووداوی ئێران – کۆنترا

ڕەنگە سەردەمی سەرۆك کۆمار ڕۆناڵد ڕیگان بەهۆی دوو ڕووداوی زەقەوە کەم تا زۆر لە بیرنەچێتەوە: یەکەمیان: شەڕ لەدژی ماددە سڕکەرەکان لە ناوخۆی وڵات و دووەمیان: شەڕ لە ئەمەریکای ناڤین بە ئامانجی ڕووخاندنی حکومەتی ساندینیستەکان (Sandinisat)ی نیکاراگوا لەلایەن هاوبەندێك لە چەند گروپێکی میلیشیای ناسراو بە کۆنترا. لە سەردەمی ڕیگان هەوڵەکانی ڕاپەڕێنەرانی یاسا

بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ قاچاغ و بەکارهێنانی مادده سڕکەرەکان چڕتر ببوو و بەدەست بڵاوییەوە لە بواری دارایی دابیندەکرا. ئەو یاساگەلە نوێ و قورسانەی بۆ بەندکردنی بەکاربەرانی مادده سڕکەرەکان و ریشەکێشکردنی چاندنی ئەم ماددانە و هەروەها جێبەجێکردنی یاسا لەسەر شەقامەکان کە پڕوپاگەندەکانی راگەیاندنە گشتییەکان بە سەرۆکایەتی نانسی ریگان (ژنی یەکەمی ئەمەریکا) و بە دروشمی ((تەنیا بڵێ ئا)) تەواوکەری ئەو هەوڵانە بوو.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو پارە و وزە و کاتەی دەوڵەتی ریگان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ بەکارهێنانی نایاساییانەی مادده سڕکەرەکان، خەرجی دەکرد، تێگەیشتن لەو ڕاستییە تاڕادەیەك جێگەی سەرسوڕمانە، کە ڕاپەڕێنەرانی یاسای فیدراڵ لە ناوخۆی ئەمەریکا لەو کاتەی لەگەڵ مادده سڕکەرەکان بەربەرەکانیان دەکرد، ڕاپەڕێنەرانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ریگانیش شەڕێکیان لە ئەمریکای ناڤین وەڕێخستبوو و خەرجییەکانی ئەم شەڕەیان لە قاچاغی مادده سڕکەرەکان دابیندەکرد. دوای کۆتایی هاتنی خولی سەرۆك کۆماری رۆناڵد ریگان کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێز لەلایەن لێکۆڵەوەران و ڕۆژنامەنووسان و کۆمیتەکانی ناو کۆنگرێسی ئەمەریکا پێشکەش کران و کە نیشانیان دەدا خەرجییەکانی شەڕی شاراوەی کۆنتراکان و دەوڵەتی نیکاراگوا تاڕادەیەکی زۆر لەم ڕێگایانەی خوارەوە دابیندەکرا:

١- ئەو پارەیەی ڕاستەوخۆ لەلایەن قاچاغچییە گەورەکانی کۆکایین دەدرا بە کۆنتراکان.



٢- گەلاڵەی ((چەك لەجیاتی ماددەی سڕکەر)) کە کارتێلەکانی کۆکایین دەستیان تێدا هەبوو.

٣- قاچاغی ڕاستەوخۆی مادده سڕکەرەکان لەلایەن ژمارەیەك لە ڕێبەرانی کۆنترا.

ئێستا روون بۆتەوە ئەو بودجەیەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پێناوی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کۆنتراکانی تەرخانکردبوو، ڕاستەوخۆ دەگەیشتە دەستی قاچاغچییە بەناوبانگەکان.

((ڕووداوی ئێران — کۆنترا)) پرسیارگەلێکی سەیر و سەمەرە لە سەر ئەولەوییەتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەخاتە مێشکەوە: ئایا دەوڵەتی ریگان پتر هۆگری دژایەتی لەگەڵ قاچاغی مادده سڕکەرەکان بوو یان شەڕ لەگەڵ ئەو سیاسەتەی خۆی ناوی نابوو مەترسی کۆمۆنیزم؟ ئایا حکومەتی ریگان لەو باوەڕە دابوو دەتوانێ بە هەردوو ئامانجەکە بگات، لە کاتێکدا تێگەیشتبوو نەیتوانیوە بەهیچ کامێکیان بگات؟ ئایا حکومەتی ریگان بە ئەنقەست هۆگری ڕەخساندنی دەرفەتی سەرمایەگوزاری بۆ کۆمپانیا و دەوڵەمەندانی ئەمەریکا بوو، لەم رووەشەوە شەڕ لەگەڵ مادده سڕکەرەکانی لەبەر چاوچنۆکی و تەماحی کەرتی تایبەت کردە قوربانی؟ ئایا کاربەدەستانی دامودەزگا جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتی ئەمەریکا لەبەر ئەوەی دژایەتی لایەنی نارەزایی هەیە لە ژیانی ئابووری و سیاسی ئێستادا، بۆیە دوای سیاسەتی دژ و دژبەیەك کەوتبوون؟[٤٢] ناتوانین بەدڵنیایی و بەمکوڕییەوە بڵێین کەسێك بۆ نموونە

سەرۆك كۆماری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ئاگای لە ئەنجامەكانی سیاسەتە جۆربەجۆرەكان بووە. ئەوەی بەمكوڕییەوە دەتوانین بڵێین ئەوەیە كە سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بۆ كۆنترۆڵی كۆمۆنیزم یان بۆ گەشەپێدانی كەرتی تایبەت، بووە هۆی یارمەتی و هاوكاری لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی خەریكی قاچاغی مادده سڕكەرەكان بوو، هەروەها لە ناوخۆی وڵاتەكەشیدا لەگەڵ بەكاربەرانی مادده سڕكەرەكان دەجەنگا.

## پشتیوانی كارتێلی مێدێلین لە كۆنتراكان

ڕاستەوخۆترین پەیوەندی لە نێوان شەڕی نهێنی ڕیگان لە نیكاراگوا و كارتێلەكانی كۆكایین بە شایەتیدانی ڕامۆن میلیان ڕۆدریگێز (Ramon Milian Rodriguez) لە بەردەم كۆمیتەی لاوەكیی كۆمیتەی پەیوەندیەكانی دەرەوەی سێنا ئاشكرابوو. میلیان ڕۆدریگێز سەرۆكی بەشی خاوێنكردنەوەی پوڵی كارتێلی مێدێلین (Medellin Cartel) بوو، ئەو لە ڕەوتی هەوڵە سەرەتاییەكانی «سی ئای ئەی» بۆ لەناوبردنی كاسترۆ لە كوبا، دەستیكرد بە چالاكییەكانی لە بواری ژمێریاری و خاوێنكردنەوەی پارەو پوڵ. میلیان لەلایەن مانۆیڵ ئارتایم كە ڕێبەری كوبایی دژی كاسترۆ و بەكرێگیراوی «سی ئای ئەی» بوو، لەسەر كار دامەزرا. میلیان بۆ هەمواركردنی شێوازگەلێكی ئاڵۆزی دارایی بۆ شاردنەوەی سەرچاوە داراییەكانی هەوڵە سەرەتاییەكانی سی ئای ئەی لەدژی كوبا ڕاهێنرا بوو. ئەو كەڵكی دواتر لەم ئەزموونانە وەرگرت بۆ كارتێلی كۆكایینی مێدێلین.



میلیان لە ماوەی ساڵەكانی ١٩٨٢-١٩٨٥ لە ڕێگای دەڵاڵە داراییەكانی هیندۆراس، گوتیمالا، كوستاریكا و مەیامی ١٠ ملیۆن دۆلار لە یارمەتییە داراییەكانی قاچاخچیانی مادده سڕكەرەكانی كۆڵۆمبیای گەیاندە دەستی كۆنتراكان.

بەپێی شاهیدی میلیان ڕۆدریگێز، كارتێلی مێدێلین ئەوەی قەبووڵ كردبوو لە بەرامبەر بەدەستهێنانی هاوكاری واشینتۆن، یارمەتی كۆنتراكان بدات: «كارتێلی مێدێلین پێی وابوو تەنیا دەتوانێ كەمێك دۆستایەتی دەوڵەتی ئەمەریكا بەدەستدەهێنێ. ئێمە دەمانویست كەمێك ڕوانگە و دۆستایەتی باشی ویلایەتە یەكگرتووەكان بەدەستبهێنین و قازانجی لێ وەرگرین. لە ڕوانگەی كارتێلی مێدێلین بەهرەی ئەم كارە ئەوە دەبوو كە سی ئای ئەی یان دەزگای بەربەرەكانی لەگەڵ مادده سڕكەرەكان كەمتر لەلاق و قوڵی دەئالاّ»[43].

بەپێی شایەتی میلیان ڕۆدریگێز، نوێنەری خاوەن ئەزموون و كۆنەكاری سی ئای ئەی بەناوی فیلیكس ڕۆدریگێز (Felix Rodriguez) یارمەتیەكانی كارتێلی قاچاغی مادده سڕكەرەكانی بۆ كۆنتراكان ڕێكدەخست. فیلیكس ڕۆدریگێز شوێن و كاتی بۆ دانی پارەو پوڵ دیار دەكرد. میلیان لە شاهیدییەكانی دا وتی: «فیلیكس لە بارەی شوێنی ناردنی پارەكان هەندێك فەرمانی بە من دا»[44]. فیلیكس ڕۆدریگێز لە بنكەی ئاسمانی ئایلۆ پنگۆی (Illo pango) سلفادور نیشتەجێ بوو و لەوێشەوە چالاكییە ئاسمانییەكانی بۆ ناردنی یارمەتی بۆ كۆنتراكان كۆنترۆڵ كرد. گرینگتر لەمە فیلیكس ڕاستەوخۆ لەگەڵ نووسینگەی

نوێنەرایەتی جۆرج بوش پەیوەندی هەبوو، لەوێشەوە یارمەتی وەردەگرت. لە ڕاستیدا هەر لەو ماوەیەی پارەی کارتێلەکانی کۆکایین دەنێردرا بۆ کۆنتراکان ئەوا بەشێوەیەکی دیار فیلێکس سێ جار لەگەڵ یاریدەدەری سەرۆک کۆماری ئەمریکا دیداری کردووە[٤٥].

## قاچاغی مادده سڕکەرەکان لە لایەن کۆنتراکانەوە

کۆنتراکان هاوکات لەگەڵ ئەوەی پارەیان لە مێدێلین وەردەگرت لە بوارەکانی دیکەیش کە لە ڕێگای قاچاغی مادده سڕکەرەکان یارمەتی دارایی دەدران، زۆر بە چڕوپڕی خەریکی چالاکی بوون. شەڕی نهێنی دەوڵەتی ڕێگان بەهۆی پەسەندکردنی ریفۆرمی بۆلاند (Boland Amendment) لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٨٦ و بڕانی هەموو یارمەتییە سەربازییەکان بە کۆنتراکان، زۆر بە توندی توشی گرفت ببوو. لە ئاکامدا ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتی ڕێگان لە پێدانی دووبارە دەسپێکردنەوەی یارمەتیدانی کۆنتراکان بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە تایبەتییەکان ئۆپراسیۆنێکی نهێنی و شاراوەیان ڕێکخست. کۆلۆنێلی دووهەم بەناوی ئۆلیوێر نورس ئەم ئۆپراسیۆنە نهێنییەی ڕێنمایی دەکرد (ئەو ئێستا خانەنشینی سوپایە و وەك پاڵێوراوی کۆماریخوازەکان بۆ نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی سێنا لە ویلایەتی ڤیراجینا دەنگی نەهێناوە).

بەشێك لەو بودجەیەی ئۆپراسیۆنی یارمەتی و ڕێکخستنی کۆنتراکان لە پارەی گروپە بازرگانییە دەوڵەمەند و باوەڕپێکراوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و



هەندێك سەرچاوەی دارایی گەورەی دەرەکی وەکو شێخ نشینە نەوتییەکانی عەرەب دابیندەکرا، بەڵام بەشێکی دیکەی ئەو سەرچاوە داراییە کە بۆ دابین و پڕچەککردنی دووبارەی کۆنتراکان کۆدەکرایەوە لە فرۆشتنی مادده سڕکەرەکان دابین دەکرا، بەو پارەیە چەك و تەقەمەنییان بۆ کۆنتراکان دەکڕی.

کلیلی ئەم ئۆپراسیۆنە (قاچاغی مادده سڕکەرەکان لە بەرامبەر چەك) کێڵگەیەکی باکوری کۆستاریکا بوو، کە خاوەنەکەی کەسێکی ئەمەریکا بەناوی جان هۆل (John Hull) بوو. لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی لاوەکی لێکۆڵینەوەدا (سەر بەکۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنا) هاتبوو، کە هۆل لە ساڵەکانی ١٩٨٤ -١٩٨٥ مانگانە ١٠ هەزار دۆلاری لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وەرگرتووە[٤٦]. ئەفسەرانی پایەبەرزی دەزگای هەواڵگری دەیانگوت: «هۆڵ پارەیەکی زۆری وەرگرتووە و هەرچییەکی سی ئای ئەی داوای لێکردووە ئەنجامیداوە»[٤٧].

دوو کەس لە ڕاستڕەوی کوبایی و ئەمەریکایی، بەناوەکانی فلیپ ڤاڵ ( Felipe Vidal) و ڕێنێ کۆربۆ ( Rene Corbo) کێڵگەی هۆلیان بۆ چالاکییەکان وەکو یارمەتی بەکاردەهێنا. فرۆکەکانی پاپلۆ ئیسکۆبار (Pablo Escober) و جۆرج ئۆچوا (Jorge Ochoa) کە باری کۆکایینیان پێ بوو لە کێلگەی هۆڵ خاڵی دەکران و دواتر هەر ئەم کۆکایینە لە ڕێگای ئاسمان و دەریاوە بەقاچاغی دەبردرانە ئەمەریکا. ئێسکۆبار و ئۆچوا لە بەرامبەر کەڵك وەرگرتن لە ئاسانکارییەکانی کێلگەی هۆڵ ئەو کارە «شەڕکەرانی ڕزگاری»ی ڕێگان

ئەنجامیان دەدا، بڕێك پارەیان دەدا لە چەند شایەدییەکی بەرچاوی ئۆپراسیۆنی ناردنی کۆکایین سەلمێندراوە، بۆ وێنە جۆرج مۆرالز (George Morales) کە یەکێك لە گەورە قاچاغچیانی گرنگی کوبایی — ئەمەریکای دانیشتووی مەیامی بوو، لە ساڵی ١٩٨٤ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە تاوانی قاچاغی ماددە سڕکەرەکان مەحکوم کرابوو، رایگەیاندووە ئەفسەرە سەربازییەکانی کۆنترا دوای گیرانی ئەو (کە بەلایەنی کەمەوە کەسێکیان بەناوی ئۆکتاڤیانۆ سێزار "Octaviano Cesar" دا دەستەی «سی ئای ئەی» بوو، بۆ مامەڵە پەیوەندییان پێوە کردووە و پێییان وتووە ئەگەر لە رێکخستنی کاروباری قاچاغی ماددە سڕکەرەکان و چەك کۆنتراکان یارمەتییان بدات، ئەوە سزاکەی هەڵدەوەشێتەوە[٤٨]. بە دڵنیاییەوە ئەوە پێشنیازێك نەبوو مۆرالز رەتیبکاتەوە، ئەو ٣ ملیون دۆلار پارەی بەخشیوە بە کۆنتراکان، فڕۆکەوان و ماڵ و فڕۆکەی خستۆتە ژێر دەستی ئەوان. مۆرالز فڕۆکەوانەکانی بۆ گەیاندنی چەك بۆ کێڵگەی هۆڵ لە کۆستاریکا و پێدانی بە کۆنتراکان بەکرێ دەگرت. ئەم فڕۆکەوانانە لە کۆستاریکاوە بە ماددەی سڕکەر دەگەڕانەوە. مۆرالز لە بەرامبەر هەر فڕینێك ٣٠٠ هەزار دۆلاری دەدا بە هۆڵ[٤٩].

فڕۆکەوانێکی مۆرالز دانی بە داواکارییەکانی مۆرالز دانا. ئەو فڕۆکەوانە ناوی گاری بیتزنەر (Gary Betzner) بوو وردەکارییەکانی ناردنی چەك بۆ کێڵگەی هۆڵ و بارکردنی ماددەی سڕکەر لەوێوە ئاشکرا دەکات: «من دوو بار چەکم بە فڕۆکە بچووکەکەم بۆ کێڵگەی جان هۆڵ لە کۆستاریکا برد و نزیکەی ١٠٠٠ کیلۆ کۆکایین گەڕامەوە فلۆریدا». باشترین لێکدانەوەی بێتزنەر ئەوە بوو کە



دەیگوت قازانجی سافی ئەو بارە ماددە سڕکەرانەی ئەو بردوویەتی بۆ کۆنتراکان لە دەوروبەری ٤٠ ملیۆن دۆلار بووە[٥٠]: فڕۆکەوانێکی دیکە بەناوی مایکل تۆلیڤەر «Michael Tolliver» هەندێ بەڵگەی پێشکەش کرد و لەو بەڵگانەدا رونیکردۆتەوە خۆی بە چ شێوەیەك لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٨٦ دا بارێکی چەکی قورسی ٢٨ هەزار پاوەندی بۆ بنکەی ئاسمانی ئاگواکەیت (Aguacate) لە هیندۆراس بردووە. هێزەکانی کۆنترا دوای داگرتنی ئەم چەکانە بری ٢٥٣٦٠ پاوەند ماری جوانیان لە فڕۆکەکەی ئەو بارکرد و ئەویش راستەوخۆ ئەو بارەی بردە بنکەی ئاسمانی هۆمستید (Home Stead) لە فلۆریدا، تۆلیڤەر لە بەرامبەر ئەو بارە ٧٥ هەزار دۆلاری وەرگرت[٥١].

قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لە کێڵگەی هۆڵەوە بۆ ئەمەریکا لە رێگای دەریاشەوە ئەنجام دەدرا. لە قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لە رێگای دەریاوە دوو کۆمپانیای هێنانە ژوورەوەی کەلوپەلی خۆراکی لە مەیامی بەناوەکای ئوشن هانتێر (Ocean Hunter ) و مستەر شریمپ (Mr. Shrimp , Inc) رۆڵی سەرەکییان هەبوو. هەردوو کۆمپانیاکە لەلایەن رۆدریگێزەوە دامەزرابوون و هەردووکیان لە ژێر خاوەندارێتی فرانسیسکۆ پاکۆ چانز (Francisco Paco Chanes) دابوون. بۆ قاچاغی کردنی ماددە سڕکەرەکان لە رێگای دەریاوە کۆکایینیان بە ئۆتومبێلی بارهەڵگر لە کێڵگەی هۆڵ لە باکوری کۆستاریکا دەگواستەوە بۆ بەندەری لیمۆن (Limon) لە هەمان دەوڵەت و لەوێشەوە لەناو بەستەکانی قرژاڵی دەریای بەستوو جێ سازی دەکرد و دەیاننارد بە بەندەرە

کانی کەنداوی مەکسیك و لەوێشەوە دەیانبردنە مەیامی. یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیسی بەشی «دید» بەناوی جەیسز گارسیا – Nicarguan Humanitarian (Office Aid) هاوکاری لەگەڵ ئەم دوو کۆمپانیایە دەکرد و بەشداری لە چالاکییەکانیان دەکرد. ئەو بەم شێوەیە لەسەر کۆمپانیای ئوشن هانتێر دەدوێ: «ئەم کۆمپانیایە تەنیا دەمامکێك بوو، چونکە ئەوان ئەو شتەی دەیانویست بیهێننە ناو وڵاتەوە کۆکایین بوو»[٥٢].

پاکۆ چانز و شەریکەکەی بەناوی مویسنز داگوبێرتۆ نۆنێز بڕی **٢٣١٥٨٧** دۆلاریان لەو یارمەتییە مرۆڤدۆستانەیە وەرگرت کە نووسینگەی یارمەتییە مرۆڤدۆستەکان (بۆ نیکاراگوا)ی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بۆ کۆنتراکانی تەرخان کردبوو، ئەم پارەو پوڵانە لەلایەن کۆمپانیایەکی دەمامکداری دیکە بەناوی فیگۆریفیسکۆس دوپۆنتارناس (Figorificos de Puntarenas) خاوێن دەکرانەوە. بەشێك لەم سەرچاوانە داراییانە دەخرانە ناو بانکەکانی ئیسرائیل و کۆریای باشور. سەرۆکی نووسینگەی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان بۆ نیکاراگوا بە پێداگریی ئادلفۆ کالێرۆ (Adolfo Calero) (یەکێك لە ڕێبەرکانی کۆنترا) و ئۆلیڤەر نۆرس بە ڕۆبێرت ئۆوین (Robert Owen) سپێردرابوو. دۆستان و نزیکانی ئۆوین بەم شێوەیە لەسەر گرێبەستەکەیان لەگەڵ چانز دەدوێن: کۆمپانیاکانی خۆراکی دەریایی «وەك دەستخۆشانەی هاوکاری لەگەڵ نۆرس پێشکەش کرابوو». سەرچاوەکانی دیکە دانیان بەوە داناوە کە ئۆوین دەیزانی هاوکاری لەگەڵ قاچاغچیانی ماددە سڕکەرەکان دەکات و سەرچاوەی داراییان بۆ دەدۆزێتەوە[٥٣].



یەکێکی دیکە لە بازرگانەکانی ماددە سڕکەرەکان لە دەستبلاوییەکانی نووسینگەی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکانی بۆ نیکاراگوا بەهرەمەند بووە. ئەو نووسینگەیە لە شوباتی ساڵی **١٩٨٦** مۆڵەتی بەستنی گرێبەستێکی بەنرخی **٩٧** هەزار لەگەڵ مایکل پاڵمێری (Michael Palmer) یاریدەدەری کۆمپانیایەکی گواستنەوەی ئاسمانی بەناوی ڤۆرتێکس (Vortex,Inc.) پاڵمێر لە ساڵی **١٩٨٥** لە کۆلۆمبیا بەتاوانی قاچاغی ماددە سڕکەرەکان و جارێکی دیکەش **١٩**ی حوزەیرانی ساڵی **١٩٨٦** بەتاوانی پیلانگێڕان و لە دەستدابوونی ماددەی سڕکەر مەحکووم کرابوو. پاڵمێر لە داواکارینامەی تاوانەکەیدا بەگواستنەوەی ١٠٠٠ پاوەندی ماری جوانا لەکۆلۆمبیاوە بۆ ئەمریکا لەگەڵ تاقمێك لە تاوانباران تۆمەتبار کراوە. پاڵمێر لە سێپتێمبەری ساڵی **١٩٨٧** جارێکی دیکەش بە گواستنەوەی ٤٤ ملیۆن دۆلار کۆکایین و ماری جوانا لە ڕێگای ئاسمانییەوە لە کۆلۆمبیاوە بۆ میشیگان لەگەڵ تاقمێك لە قاچاغچیان تۆمەتبار کرا.

نووسینگەی یارمەتییە مرۆڤدۆستەکان بۆ نیکاراگوا چووە شوێنی دوو قاچاغچی دیکەی ماددە سڕکەرەکان. ئەم نووسینگەیە گرێبەستێکی لەگەڵ سێتکۆ ئایر (Setco Air)، کە کۆمپانییایەکی گواستنەوەی ئاسمانییە و تایبەتە بە قاچاغچییەکی هیندۆراسی بەناوی ڕامۆن ماریا باڵترۆس ( Ramon Maria Ballestros) و کۆمپانیای دایسکای (Diasca ) مەیامی کە بەناوەندی چالاکییە بەرفراوانەکانی قاچاخی ماددە سڕکەرەکانی فلۆید کارێلتۆن ( Floyd Carlton) و ئەلفرێد کاباڵیرۆ (Alfredo Caballero) چالاکی دەکرد گرێدا.

وێنەگەلێکی دیکەش لەسەر قاچاخی مادده سڕکەرەکان لەلایەن کۆنتراکانەوە هەن بۆ نموونە:

* لە سانفراسیسکۆ ٤٣٠ پاوەند کۆکایینی گروپێکی گرنگی قاچاغی کۆکایین کە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٣ لە کوستاریکا کاری دەکرد و پێوەندی لەگەڵ کۆنتراکان هەبوو زەوت کرا، ئەم کۆکایینە لە پاپۆڕێکی بارهەڵگری کۆلۆمبیایی دابەزێندرابوو. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو ٣٦٥٢٠ دۆلارەی کە لە ئۆپەراسیۆنی بەربەرەکانی لەگەڵ قاچاغی مادده سڕکەرەکان لە تۆمەتبارانی قاچاغی ئەم ماددەیە زەوتی کردبوو دایەوە بە خۆلیۆ زاڤاللا (Julio Zavala)، چونکە ئەو بە پێشکەشکردنی چەند نامەیەکی ڕێبەرانی کۆنترا داوای خاوەندارێتی ئەو پارانەی دەکرد. زاڤاللا لە ڕەوتی دادگاییکردنەکەیدا شایەتی دا نزیکەی ٥٠٠هەزار دۆلاری داوە بە یەکێك لە ڕێبەرانی کۆنترا بەناوی فیرناندۆ چامۆرۆ (Fernando Chamorro) و ئەویش هاوکارییەکی نزیکی لەگەڵ جان هۆڵ هەبوو[٥٤].

* کەسێکی دیکە کە لە ڕووداوی قاچاغی مادده سڕکەرەکان بۆ سانفرانسیسکۆ دەستی هەبوو، ناوی نۆروین مینێسز کانترۆ (Norwin Meneses - Cantero) بوو. کانترۆ برای سەرۆکی پۆلیسی پێشووی ماناگوا لە سەردەمی دیکتاتۆریەتی سۆمۆزا بوو، کە دوای گەیشتن بە دەسەڵات ساندینیستەکانی لەسەر کار لابرد. دەزگای بەربەرەکانی لەگەڵ مادده سڕکەرەکانی ئەمریکا لە یاداشتی ٦ی شوباتی ساڵی ١٩٨٤یدا مینێسز بە ((سەرکردەی ئاشکرای ڕێکخراوی تاوانکاری کە



بەرپرسیاری قاچاغی چەندین کیلۆ کۆکایینە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)) ناودێر دەکات[٥٥].

* کەسێکی دیکەش کە دەستی لە فایلی زەوتکردنی کۆکایینی سانفرانسیسکۆدا هەبوو، هۆراشیۆ پێریرا (Horacio Pereira)ی پشتیوانی کۆنتراکان بوو، کە لە کۆستەریکا دەژیا. پێریرا ساڵی ١٩٨٦ لەلایەن کاربەدەستانی کۆستەریکا دەستبەسەر کرا. لە ڕەوتی دادگاییکردنەکەیدا، کاسێتێکی پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی لەگەڵ خوان سباستیان گۆنزالێز مندیۆلا کە لە دەرەوەی کێڵگەی جان هۆڵ کاری دەکرد بڵاوکرایەوە: ((ئەوان لە وتووێژە تەلەفۆنییەکەیاندا لەسەر کۆکایینی زۆر کە خەریکی ناردنی بوون بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان قسەیان کردبوو. ئەو پێوەندییە تەلەفۆنیانە نیشانیان دەدا کە دەڵاڵانی مادده سڕکەرەکان لەگەڵ ڕێبەرانی پایەبەرزی دەوڵەتی کۆستەریکا پێوەندییان هەیە))[٥٦].

## لەچ شتێك و کەی ئاگاداربوون ؟

بەڕواڵەت قاچاغی کۆکایین لەلایەن کۆنتراکانەوە بە کردەی توندوتیژ ئەنجامدەدرا و ئەمەش وەك بەشێکی گرنگی ستراتیژی ئەوان بووە بۆ دابینکردنی سەرچاوەی دارایی پێویست بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی نیکاراگوا، بەڵام ئەم پرسیارە هەر لەجێی خۆی ماوەتەوە ئایا کاربەدەستە پایەبەرزەکانی دەوڵەتی ئەمریکا ئاگایان لە قاچاغی مادده سڕکەرەکان بوو و ئەگەر ئاگاداربوون بۆ ڕاگرتنی ئەم چالاکییانە

چ هەوڵێکیان داوە؟ بەپێی هەموو بەڵگە و شاهیدەکان، کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاگایان لەم بابەتە هەبووە. لە سەرەتای مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٥ سەرۆکی دەزگای بەربەرەکانی لەگەڵ ماددە سڕکەرەکانی ئەمریکا لە سان خۆزەی (San Jose) کۆستەریکا بە ڕۆژنامەنووسانی وت: (ئێمە ڕاپۆرتگەلێکمان پێ گەیشتووە کە نیشانی دەدات ژمارەیەك لە گروپەکان بەبیانووی ناردنی چەك بۆ شۆڕشگێڕانی کۆنترا خەریکی قاچاغی ماددەی سڕکەرن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)[٥٧]. لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٦ کەناڵی هەواڵنێری (ABC) ڕایگەیاند: پشکێنەرانی کۆمیتەی لاوەکی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی سێنا هەندێك بەڵگەیان دۆزیوەتەوە نیشانی دەدا ((کۆنتراکان بارە قاچاغەکانیان بە بەلەمە بازرگانییەکانی گواستنەوەی قرژاڵی دەریایی لە ئەمریکای ناڤینەوە ناردۆتە مەیامی)).

ڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٧ دا ڕایگەیاند: (بەپێی وتەی چەندین کاربەدەستانی چەندین دەزگای دەوڵەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەزگای بەربەرەکانی لەگەڵ ماددە سڕکەرەکانی ئەمریکا لە گوتیمالا لە سەرەتاکانی پاییزی ڕابردوو ر(١٩٨٦) کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێزی بەدەستکەوتووە کە دەریدەخات ئۆپێراسیۆنی ناردنی کەلوپەلی سەربازی بۆ کۆنتراکان لەڕاستیدا ئۆپێراسیۆنی قاچاخی کۆکایین و ماری جوانا بووە)).



لە شوباتی ساڵی ١٩٨٦دا ڕاوێژکاری سەرەکی کۆمیتەی لاوەکیی پێوەندییەکانی ئەنجوومەنی دەرەوەی سێنا بەناوی جەك بلوم (Jack Blum) کە لەسەر ئۆپێراسیۆنی یارمەتی و پڕچەککردنی دووبارەی کۆنتراکان لێکۆڵینەوەی دەکرد، ڕایگەیاند: ((بەپێی ئەو شتانەی بیستوومانە لەو باوەڕەداین هیچ گومانێك لەوەدا نییە کۆنتراکان و ڕێکخستنەکانی دەستیان هەبووە لە بازرگانی کۆکایین و هێنانە ژوورەوەی بۆ فلۆریدا و لە ئاکامدا کۆمیتەی هەڵبژێردراوی نوێنەرانی ئەمریکا سەبارەت بە چەوت کەڵك وەرگرتن لە ماددە سڕکەرەکان و کۆنترۆڵ کردنیان ڕاپۆرتێکی لە بەڕێوەبەرایەتی گومرگی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەدەست گەیشتووە و تێیدا ناوی ٣٨ کەس و کۆمپانیای چالاك لە ئۆپەراسیۆنی یارمەتی و پڕچەککردنی دووبارەی کۆنتراکان وەك کەسانی تێوەگلاو لە قاچاغی ماددە سڕکەرەکانی هاتووە. تەنانەت بەڵگەی سەلمێنەرتریش لە بەردەستدایە، کە دەیسەلمێنێ بەرزترین کاربەدەستانی دەوڵەتی ڕێگان ئاگایان لە کاروباری قاچاغی ماددە سڕکەرەکان هەبووە. لە ڕاستیدا بەپێی ئەو بەڵگەی دیکۆمێنتییانەی لەلایەن کۆمیتەی لاوەکی پێوەندییەکانی ئەنجوومەنی سێنا کۆکراوەتەوە ئێستا ڕوونبۆتەوە کۆلۆنێلی دووهەم بەناوی ئۆلیڤەر نۆرس نەك تەنیا ئاگاداری قاچاغی ماددە سڕکەرەکان بووە، بەڵکو هیچ هەوڵێکی بۆ ڕاگرتنی نەداوە. باڵیۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کۆستەریکا بەناوی لویز تامبز ( Lewis Tambs) لە ٢٨ی ئاداری ١٩٨٦ دا لە ڕێگای کەناڵە پێوەندییەکانی سی ئای ئەیەوە پەیامێکی بۆ نۆرس نارد و لەو پەیامەدا هاتبوو: ((یەکێك لە ڕێبەرانی کۆنتراکان بە ناوی ئادۆلفۆ چامۆرۆ (Adolfo Chamorro) بەپێی هەندێك دەنگۆ

خەریکی قاچاغی مادده سڕکەرەکانە». رابیرت ئۆوین لە سەرەتای نیسانی ساڵی ١٩٨٥ نوسراوێکی بۆ ئۆلیڤەر نۆرس نارد و لەو نوسراوەدا خۆزێ رۆبێلۆی بە کەسێکی «چالاك لە قاچاغی مادده سڕکەرەکان» وەسفکرد. لە هەمان نوسراودا هاتبوو کە سبەستیان گۆنزلێز (ڕێبەرێکی سەربازی کۆنتراکان بوو) لە پاناما خەریکی قاچاغی مادده سڕکەرەکانە. ئۆوێن لە ١٠ی شوباتی ساڵی ١٩٨٦ لە نوسراوەکەیدا بۆ نۆرس بەڕاشکاوی وتبووی لە Dc٤ یێك کە بۆ دابینکردن و پڕچەککردنی دووبارە کۆنتراکان کەڵکیان وەردەگرت «جارێك بۆ قاچاخی مادده سڕکەرەکان بەکارهێندراوە و بەشێك لە سەرنشیەنەکانی تاوانباری ناسراوبوون». لە کۆتاییدا خودی نۆرسیش لە یاداشتەکانی کۆبوونەوەی ٩ی ئوونی ساڵی ١٩٨٥ لەگەڵ رابێرت ئۆوێن، نووسیبوی: «Dc4کە بۆ ناردنی یارمەتی لە نیوئۆرلیان بەکاردەهێنرێت ڕەنگە بۆ قاچاغی مادده سڕکەرەکان بۆ ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا کەڵکی لێوەرگیرابێت».

لە ئاکامدا نۆرس بەهۆی شایەتیدانی بە درۆ لەسەر ڕۆڵی خۆی لەڕووداوی ئێران — کۆنترا کە لەبەردەم کۆمیتەکانی کۆنگرە دابووی مەحکوم کرا. سەیر ئەوەیە کە سزای نۆرس لە دادگای تێهەڵچوونەوەی فیدڕاڵ بەپێی یەکێك لە تەکنیکە یاساییەکانی خۆی کە لە کاتی رکابەرییەکانی بۆ هەڵبژاردنی وەك نوێنەری ئەنجوومەنی سێنا کەڵکی لێوەردەگرت، هەڵوەشێندراوە.



## ئێوە بڕیار بدەن: ئایا تیرۆریزم تاوانێکی ڕێکخراوە ؟

ساڵانێکی زۆرە پسپۆڕانی تاوانە ڕێکخراوەکان لەو باوەڕەدان کە تیرۆریزم جۆرێکی جیاوازی تاوانە و لەگەڵ تاوانی ڕێکخراو جیاوازی هەیە. بەپێی وتەی ئەوان تاوانی ڕێکخراو بەمەبەستی سوودوەرگرتن ئەنجام دەدرێ و ناتوانرێ لەگەڵ کردەوە تیرۆریستییەکان کە زۆربەیان پاڵنەر و هۆکارێکی سیاسی یان ئایدیۆلۆژیان هەیە پۆلێن بکرێن. دروستە زۆربەی کردەوە تیرۆریستییەکانی وەکو کردەوەکانی بۆمبدانەر نەناسراوە، کە بەپێی هەموو بەڵگەکان هیچ مەبەست و پاڵنەرێکی سوود وەرگرانەی نەبووە و تەنیا و تەنیا لە پاڵنەر و مەیلێکی ئایدیۆلۆژییانەوە سەرهەڵدەدەن، بەڵام نابێ وێنەی ئەو کەس و گرووپانەش کە بە پاڵنەر و مەبەستی سیاسی و دارایی دەستیان داوەتە کردەوەی تیرۆریستی، لە بیر بکەین.

مۆڵەت بدەن تا سەرنجی خۆمان بدەینە سەر چۆنیەتی سەرهەڵدانی ناسراوترین گەنگێسترەکانی وەکو ئاڵ کاپۆن (All Capone) کە نەك تەنیا کاروکاسبیە نایاساییەکانی شیکاگۆ، بەڵکو سیاسەتی ئەو ویلایەتەشی بردبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئایا ئاڵ کاپۆن بەبێ بوونی پشتیوانی سیاسی سیاسەتوانە ناوچەییەکانی وەکو بیگ بێل تامسۆن (Big Bill Thompson) دەیتوانی ئەو کردەوە تاوانکارییانەی شیکاگۆ بەم شێوەیە لە دەستی خۆیدا زەوت بکات؟ ئایا تامسۆن بەبێ پشتیوانی کاپۆن دەیتوانی لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوێ ؟

ڕەنگە پێویست بێ ئەو ڕاستییە لەبەرچاوگرین کە هەرچەند کاپۆن هیچ ئارەزوویەکی ئاشکرای بۆ هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسەت نەبوو، بەڵام مەیلی

دەوڵەمەندبوون وایدەکرد کە بۆ ڕێگەگرتن لە ناسران و دووربوون لە حوکمی لە سێدارەدان و تێربوونی حەزی سوودخوازییانەی وا پێویست بوو سیاسەتوانە ناوچەییەکان بخاتە ژێر چنگی خۆی. هەروەها دەبێ سەرنج بدەینە ئەوەش کە بە دەسەڵات گەیشتنی زۆربەی گەنگێستێرە گەورەکان هاوکات بوو لەگەڵ ئەنجامدانی کۆمەڵێك کردەوەی توندوتیژی ئاشکرا و تەقاندنەوە یان سووتاندنی کارە بچووکەکان بەهۆی نەدانی باج لەلایەن خاوەنەکانییانەوە و هەروەها ئاگرتێبەردانی ئەو مەیخانانەی کە خاوەنەکانییان نەیاندەویست گەنگێستێرەکانی ناوچە ببنە برابەش لەگەڵیان. بەدڵنیاییەوە کوشتاری دڕندانەی سیخوڕەکانی پۆلیس (بە کوشتنی ئاشکرای ئەوان یان دانانەوەی بۆمب لە ئوتومبێل و...) ئاسەوارێکی خۆپارێزییانەی بێ ئەملا و ئەولای لەسەر کەسانی دیکە هەبووە کە ویستوویانە ئەو خراپەکارە تاوانبارانە ئاشکرا بکەن، بەڵام نەیانوێراوە. کارتێلی مێدێلینی ئێسکۆبار بۆ ماوەی دەیەیەك بە ئەنجامدانی کردەوەی تیرۆریستی لەدژی خەڵك و حکوومەتی کۆلۆمبیا لەگەڵ ڕێکەوتننامەی گەڕاندنەوەی تاوانباران لە نێوان ئەمریکا و کۆلۆمبیا دژایەتی کرد. ئایا دەتوانرێ ئەم کردەوە توندوتیژە ئاشکرایانەی لەلایەن تاوانبارە ڕێکخراوەکان ئەنجامدراوە بەکردەوەی تیرۆریستی ناوخۆییش بژمێرین؟

مۆڵەت بدەن لە لایەکی دیکەوە هاوکێشەکە لێکبدەینەوە. ئەگەر ڕوانگەی پسپۆڕان دروست بێ و بەڕاستی تیرۆریزم پاڵنەری ئایدیۆلۆژییانەی هەبێ نەك مەیلی سوودخوازی لەم حاڵەتدا داهاتە نایاساییەکان تا چ ڕاددەیەك لە ئەنجامدانی هەندێك لە زەقترین هێرشە تیرۆریستییەکانیش تاڕاددەیەك پێویستیان



بەوردەکاری، بەرنامەڕێژی، زانستی تەکنیکی، ئامادەکاری، زانیاری نهێنی و...هەیە بۆ ڕاهێنان، کڕینی چەك، بەکرێ گرتنی کەسەکان، دابینکردنی ئامرازی گواستنەوە و زۆر لایەنی دیکەی کاری بەرنامەڕێژکراو پێویستی بە پارە هەیە. بۆ وێنە، هەندێك لە گروپە تیرۆریستییە ناسراوەکانی وەکو سوپای یەکگرتووی «شان» لە میانمار (Myanmar Shan United Army) ئێم -١٩ لە کۆلۆمبیا و ڕێگای درەوشاوە لە پیرۆ لەو قازانجەی لە ڕێگای بازرگانی ماددە سڕکەرەکان وەدەستیان دەکەوێ بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی شۆڕشەکەیان کەڵکی لێ وەردەگرن، بەبێ ئەم سەرچاوە زۆرەی داهات زۆربەی گروپەکان ناتوانن درێژە بە چالاکییەکانیان بدەن یان بە گشتی هەڵدەوەشێنەوە. بەم پێیەش حەزی سودخوازی پازێکی هاوبەشی ئاشکرای لەگەڵ هەموو ڕووداوە ئایدیۆلۆژییەکان هەیە.

بەم شێوەیە ڕووبەڕووی لوغزێکی سەرنج ڕاکێشین. ئایا دەبێ کردەوە تیرۆریستییەکان بەتاوانێکی ڕێکخراو لەقەڵەم بدەین؟ بەپێچەوانەوە، ئایا هەندێك لە کاروبارەکانی تاوانبارە ڕێکخراوەکان وا ناخوازێ پەنا ببەنە بەر کردەوەی تیرۆریستی؟ ئایا تیرۆریزم تاوانێکی ڕێکخراوە؟ ئێوە بڕیار بدەن.

### تیرۆریزمی ناوخۆیی (Domestic Terrorism)

ئەگەرچی لە زۆربەی کردەوە تیرۆریستیە نێودەوڵەتییەکاندا بازرگان و گەشتیاران و چالاکییە ئابورییەکان لە دەرەوەی سنووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوونەتە ئامانج، بەڵام خودی ئەم دەوڵەتە تاڕاددەیەك لەم جۆرە تاوانانە بەدوور

بووە. لە ڕاستیدا لە ڕوانگەی زۆربەی ئەمریکییەکانەوە تیرۆریزم شتێکە تەنیا لە ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین یان هەموو وڵاتێك جگە لە ئەمریکا ڕوودەدات. ساڵانێکی زۆر لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ترس لە تیرۆریزمی ناوخۆیی لە هەمان ئاستی ترسدا کورت دەکرایەوە، بەڵام لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٩٠ئەو تێڕوانینە گۆڕانی بەسەر داهات. یەکێك لە ئامانجەکانی ئەم بەشە لەم نووسینەدا بریتیە لە داڕشتنی پرسیار و ئەو خراپ تێگەیشتنەی کە لە تیرۆریزمی ناوخۆیی هەیە، بۆ ئەوەی دواتر ئەم بابەتە لە چوارچێوەیەکی گشتی دیکەدا شیبکەینەوە، بەڵام بەرلەوەی باسی تیرۆریزمی ناوخۆیی دەستپێبکەین، دەبێ وەبیرتان بهێنینەوە لە سەر پێناسەی ئەم دیاردەیە ڕێکەوتنێکی گشتی لەبەردەستدا نییە و لەم ڕووەشەوە بەکردەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ یاسایەك نییە بە شێوەیەکی دیارکراو بۆ کۆنترۆڵی کردەوە تیرۆریستییەکان نوسرابێتەوە. ئەم ڕاستیە کۆمەڵێك پرسیاری لێدەکەوێتەوە. ئایا کردەوە تیرۆریستییە ناوخۆییەکان بەپێی تاوانە ئەنجامدراوەکان پێناسە بکرێت یان بەپێی ئەنجامدەران یان ئەو کەس و ڕێکخراوانەی کە پشتیوانیان لێدەکەن؟ ئایا ئەگەر بیانییەکان بەهۆی بەهرەمەندبوونیان لە پشتیوانی دەوڵەتێکی بێگانە لە ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردەوەیەکی تیرۆریستی ئەنجام بدەن، دەتوانین ئەوان بە تیرۆریستی ناوخۆیی لەقەڵەم بدەین؟

بەهۆی ئەوەی کە لە یاسا فیدراڵیەکانی ئەمریکا هیچ پێناسەیەکی فەرمی بۆ تیرۆریزمی ناوخۆیی نەکراوە، ئەو کەسانەی بە تۆمەتی تێوەگلان لە تیرۆریزمی ناوخۆیی دەگیرێن بەپێی یاسا ئاساییەکانی سزا تاوانبار دەکرێن و هیچ گرنگیەك



نادەن بە پاڵنەرەکانیان بۆ ئەنجامدانی کردەوەکە یان ڕۆڵی ئەوان وەك نوێنەری ڕێکخراوێکی گەورەتر کە بە دوای ئامانجێکی تایبەت دەگەڕێ. دروستە جارجارێك بۆ دژایەتی کردنی هەندێك لە شێوازەکانی ئەم ئاکارە تاوانکارییانە پەنا دەبەنە بەر پەیڕەونامەی ریکۆ (Rico Statute) بەڵام تاوانباران لە زۆربەی بابەتەکاندا بە پێشێلکردنی یاسا سزاییە تاکەکان تۆمەتبار دەکرێن.

مۆڵەت بدەن تا بەرهەمێکی تێد رابێرت کور (Ted Robert Curr)، مامۆستای زانستە ڕامیارییەکانی زانکۆی نۆرس و سترین کە بۆ شرۆڤەکردنی تیرۆریزمی ناوخۆیی نووسیویەتی و زۆر جێگەی متمانەیە بخەینە بەر چاومان. کور لەو لێکۆڵینەوەیەی بە هاوکاری جی بۆوێر بێل (J. Bowyer Bell) ئەنجامی داوە تیرۆریزمی وەك تاکتیکێك لەقەڵەم دەدا کە لاوازەکان بۆ ترساندنی بەهێزەکان و بەهێزەکانیش بۆ ترساندنی لاوازەکان بەکاری دەهێنن(). ئەگەر وابێ دەبێ بڵێین ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مێژوویەکی دووروودرێژی لەگەڵ تیرۆریزم هەیە و بەتایبەت بەمانای بزاڤە سیاسیە چەپڕەوەکان کە سوودیان لە جۆرێك تیرۆریزم بۆ گەیشتن بە دەسەڵات وەرگرتووە.

نە تەنیا لە سەردەمی ئێستا بەڵگەگەلێکی زۆر هەیە نیشان دەدات تیرۆریزمی ناوخۆیی یەکێك لە گرفتەکانی ئێستای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، بەڵکو مێژووش شایەتی دەدات ئەم دیاردەیە پتر لە سەد ساڵە لەناو کۆمەڵگای ئەمریکا ڕیشەی داکوتاوە. بێڵ و کور لەو باوەڕەدان ئامانجی یەکێك لە کۆنترین شێوازەکانی تیرۆریزمی ناوخۆیی بریتی بووە لە ڕاگرتنی بارودۆخەکە و پاراستنی

ئیمتیازە ئابورییەکان[٥٩]. بۆ وێنە هەروەك لە شوێنێکی دیکە نیشانمان دا[٦٠] هەوڵ و کردەوەی هێزەکانی پاراستنی کۆمپانیاکان و پۆلیسە تایبەتییەکان لە سەدەی نۆزدەیەم دا ماهییەتێکی تیرۆریستی هەبووە. ئەم کەسانە کە پتر بۆ شکاندنی مانگرتنەکان کەڵکیان وەردەگرت بۆ پێشگری لە دەستەبەربوونی مافی ئازادی ڕادەربڕین و مافی دامەزراندنی سەندیکای کرێکاران بەکاردەهێنران. ئەو گروپ و تاقمانەی لە ویلایەتەکانی باشوری ئەمریکا بە دوای کۆیلەدا دەگەڕان و هەروەها هێزەکانی ئاسایش بۆ پاراستنی دادپەروەری لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای ئەو دەوڵەتە وەکو هێزەکانی ژێر فەرمانی چارلز لینچ (Charles Lynch) کە خۆیان یاسایان جێبەجێ دەکرد و کەڵکیان لە تیرۆر وەردەگرت بۆ بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییەکانییان بەتەواوی مانا گروپی تیرۆریستی بوون. زۆر کەسیش (کۆکلاکۆکلان)ەکان کە لە ساڵی ١٩٨٦ دامەزرابوون بە وێنەیەکی دیکەی تیرۆریزمی سەرەتایی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی دەزانن.

هەرچەندە ئەمڕۆکە زۆربەی گروپە تیرۆریستییە ناوخۆییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان گروپگەلێکی توندڕەون، بەڵام لە دەیەی ١٩٦٠ دا هەندێك لە گروپە چەپڕەوەکانی لایەنگری توندوتیژیش دەبینرێن. دەیەی ناوبراو (١٩٦٠) سەردەمی مێژوویی گۆڕانی کولتووری و کۆمەڵایەتی بوو لەگەڵ گازندە لەدژی دەستێوەردانی سەربازی لە ڤێتنام و گەشەسەندنی بزاڤی فیمینیزم, بەڵام ڕەنگە بزاڤی مافە شارستانییەکان کە بەدرێژایی ئەم دەیەیە هێزێکی بەرچاوی بەدەستهێنا و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان گروپە نەتەوەیی و نەژادییەکانی ئەمریکای لە نوێوە پێناسە کردەوە، لەم گۆڕانکارییانە گرنگتر



بێت. گەشەسەندن لە بواری دەستەبەرکردنی ئاشتی و دادپەروەری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەسەر خۆبوونی ئاهەنگی چاکسازی بووە هۆی ناکامی و دڵگرانی ژمارەیەك لە چالاکان و ئەم ناکامییەش بووە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك توندوتیژی. ئێستا لە هەندێك لە کردەوە توندوتیژە نوێترەکانی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکۆڵینەوە.

هەرچەندە تەقینەوەی ساڵی ١٩٩٥ لە باڵەخانەی ئامتراك (Amtrak)بە کردەوەیەکی زەقی تیرۆریستانی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەقەڵەمدرا، بەڵام سێ ڕووداوی دیکە زانیاری ئەمریکییەکانی سەبارەت بە تیرۆریزمی ناوخۆی بەهێزتر و تیژتر کرد: تەقینەوەی بۆمب لە ناوەندی بازرگانی جیهانی لە نیویۆرك (کە وەك نموونەیەکی تیرۆریزمی پاڵپشتیکراو لەلایەن دەوڵەتەوە دەناسرێ) بۆمبە پۆستییەکەی لە دوای یەکەکانی کەسێك بەناوی بۆمب دانەری نەناسراو کە لە ساڵی ١٩٨٧ دەینارد، ڕەنگە لە هەموویان هەژێنەرتر تەقینەوەی بۆمبێك بێ لە ساڵی ١٩٩٥ لە باڵەخانەی دام و دەزگا فیدراڵییەکان لە ئۆکلاهۆما. لێرەدا سەرەتا گرنگترین ڕووداو دەخەینە بەرچاو.

## دانانەوەی بۆمب لە شاری ئۆکلاهۆما

لە کاتژمێر ٢,٩ خولەکی بەرەبەیانی ڕۆژی ١٣ی نیسانی ساڵی ١٩٩٥ بۆمبێکی ٤ هەزار پاوەندی لەبەردەم  باڵەخانەی دام  و دەزگا فیدراڵییەکانی شاری ئۆکلاهۆما تەقینەوە و بەکردەوە بووە هۆی تێکوپێکدانی ئەم باڵەخانەیە و کوژرانی ١٦٨ کەس، لەوانەش ئەو منداڵانەی کە لە باخچەی ساوایانی نهۆمی یەکەمی ئەو باڵەخانەیە بوون، بوونە قوربانی ئەو تەقینەوەیە. ئەم کارەساتە لەو ڕووەوە کە هێرشێکی بوو بۆ سەر دڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خەڵکی ئەم وڵاتەی بەتوندی هەژاند. لەکاتی ڕوودانی ئەم تەقینەوانە پرسیارگەلێکی زۆر بێ وەڵام ماونەتەوە: بۆچی باڵەخانەکانی فیدراڵ؟ و بۆچی ئۆکلاهۆما؟ دەتوانین بڵێین باڵەخانە ناوبراوەکە ئامانجێکی سیاسی ناچالاکانە بووە بۆ تیرۆریستان. دەڵێی هێرش بۆسەر ئامانجێك لە دڵی دەوڵەت، لە هەمان کاتدا ئامانجێکی نە ئەوەندە ئاشکرا دەخاتە بەر دەستی تیرۆریستان، بەڵکو ڕەنگدانەوەیەکی زۆریشی لە هەواڵەکاندا دەبێت. لە کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٩٥ یش هەوڵێکی لەم شێوەیە درا، بەڵام بەر لەوەی بۆمبەکە لە دەرەوەی باڵەخانەی بەڕێوەبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەکانی شاری ڕێنۆ(Reno) لە نیڤادا (Nevada)بتەقێتەوە لەلایەن پۆلیسەوە دۆزرایەوە. ئەگەرچی دووکەس بە تۆمەتی تێوەگلان لەم تاوانە دەستبەسەرکران، پسپۆڕان پێیانوایە کە ئەو دوو بۆمب دانانەوەیە ڕەنگە جۆرێك لە نارەزایی بێت بۆ سەرکوتکاریی دەوڵەتی.



تیمووتی مەك ڤی (Timothy Mc Viegh) و تێری نیکۆلز (Terry Nichols) کە هەردووکیان تۆمەتباری تەقینەوەکانی شاری ئۆکلاهۆما بوون، ئەندامی پێشووی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون و بەپێی هەندێك بانگەشە ئەندامی گروپی توندڕەوی میلیشیای میشیگانیش ( Michigan Militia) بوون. ئەم گروپە زۆر پڕچەکە و بەتوندی دژی حکومەتی ئەمریکایە و ناکۆکە لەگەڵ دانی باج، دەسەڵاتەکانی کاربەدەستە فیدراڵییەکان و بەگشتی هێز و دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی فیدراڵ. لە کاتی نووسینەوەی ئەم دێڕانە ئێستاش ڕوون نییە ئایا تەقینەوەکانی شاری ئۆکلاهۆما کردەیەکی تاکەکەسی و جیا بووە لەلایەن ئەو کەسانەی بەئارەزووی خۆیان ئەنجامیان داوە یان کردەوەی ڕێکخراوێکی گەورە بووە کە هێشتا ئامانجەکانی دیارینەکراوە. ڕووداوەکانی دیکەی کۆتایی بە هەمان شێوە یەکێکی دیکە لە ڕووداوەکانی ئەو دواییانە کە زانیاری ئەمریکییەکانی لە سەر تیرۆریزمی ناوخۆیی زیاتر و تیژتر کرد تەقینەوەی تیرۆریستی ٢٦ی شوباتی ساڵی ١٩٩٣ لە ناوەندی بازرگانی جیهانی لە شاری نیویۆرك بوو. چوار پیاو لە ساڵی ١٩٩٤ بە تاوانی بەشداری لە بەرنامەڕێژی و جێبەجێ کردنی ئەم تەقینەوەیە کە بووە هۆی کوژرانی ١١ کەس و برینداربوونی پتر لە ١٠٠٠ کەس مەحکوم کران. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥ شێخ عومەر عبدالرحمن کە یەکێك لە ڕێبەرانی گروپێکی توندڕەوی ئیسلامی بوو لەگەڵ ٩ کەس لە لایەنگرانی لە سەر ئەنجامدانی ئەم تەقینەوەیە وەك تاوانبار ناسران[٦١]. ئەم گروپە پیلانی تەقاندنەوەی باڵەخانەی نەتەوە یەکگرتووەکان، نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (ئێف بی ئای) لە نیویۆرك،

دوو تونێل، پردێك و هەروەها تیرۆری ژمارەیەك دادوەر و سیاسەتوانیان دارِشتبوو. تیرۆریستێکی ناوخۆیی دیکە ڕایگەیاند ناوی بۆمبدانەری نەناسراویان لەسەر دانابوو، بۆ ماوەی نزیك بەدوو دەیە کۆمەڵگای ئەمریکا تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کرد. لە مەودای ساڵەکانی ١٩٨٧ و ١٩٩٥ هێرشەکانی ئەم تیرۆریستە بووە هۆی کوژرانی ٣ کەس و برینداربوونی ٢٣ کەسی دیکە، قوربانییانی  ئەم هێرشە پێك هاتبوون لە ئەندازیار، پڕۆگرامیست و ئەو کەسانەی هەڕەشە و مەترسیان هەبوو بۆ سەر بۆمبدانەری نەناسراو و بیروباوەڕە تایبەتیەکانی. بۆمبدانەری نەناسراو لەم ساڵانەی دواییدا لە نامەگەلێکی پڕ هەڕەشە و گوڕەشەدا بۆ قوربانییانی پێشوو و داهاتووی ناردبوو دڵەڕاوکێ و پەشۆکاوییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی خۆی دووپات کردبۆوە. تیۆدۆر کازینسکی لە نیسانی ساڵی ١٩٩٦ دا کەوتە بەرگومان و لەلایەن یاساوڵەکانی دەزگای لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ((ئێف بی ئای))یەوە لە لینکۆڵن مۆنتانا دەستبەسەر و لانی کەم بە تاوانی ئەنجامدانی یەکێك لە تەقینەوە ئەنجامدراوەکانی بۆمبدانەری نەناسراوەوە مەحکوم کرا. تا کاتی نووسینەوەی ئەم دێڕانە فایلەکە ئێستاکەش هەر کراوەیە.

بەرپرسیاریەتی سەرەکی لێکۆڵینەوە لە سەر تیرۆریزمی ناوخۆیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خراوەتە ئەستۆی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (FBI). سەرچاوە و دەسەڵاتە نەتەوەییەکەی ئەم دەزگایە بە تایبەت لەو ڕووەوە کە گروپە تیرۆریستییە ناوخۆییەکان لە پتر لە ویلایەتێك چالاکی دەکەن، ئەوی کردۆتە باشترین جێبەجێکاری یاسا لەم بوارەدا. لەبەرئەوەی کە یەکێك لە



دەسەڵات و ئەرکەکانی ئێف بی ئای ڕۆڵ گێڕانە لە بواری ئاسایشی نەتەوەیی بۆیەش ئەوە شتێکی لۆژیکیە ئەم ڕێکخراوە لەگەڵ ئەم ڕەوشتە تاوانکارییانە بەربەرەکانی بکات. هەڵبەت هەموو پسپۆڕانی بواری تیرۆریزمی ئەو باوەڕەیان نییە. ژمارەیەك لەو پسپۆڕانە باوەڕیان وایە: چونکە پۆلیسە ناوچەییەکان یەکەمین یەکەن لە بەرامبەر کردەوە تیرۆریستیەکان دژکردەوە نیشاندەدەن، بۆیەش ڕەنگە ئێف بی ئای باشترین ڕێکخراوی پاراستنی ئاسایش لە بەرامبەر تیرۆریزمی ناوخۆیی نەبێت. ئەم مشتومڕە نیشانەی پێویستی زیاتر و پێناسەکردنی وردتری ڕۆڵی جێبەجێکەرانی یاسا و دژەکردەوەیان لە بەرامبەر تیرۆریزمی ناوخۆیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

لێرەدا هەوڵدەدەین جۆرەکانی ڕێکخراوە تیرۆریستییە چالاکەکانی ناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بناسێنین. هەر کام لەو گروپانە وەکو هاوبیرە بیانییەکانیان بۆ ئەنجامدانی  کردەوەکانییان پاڵنەری سیاسی، ئایدیۆلۆژی یان داراییان هەیە. لە درێژایی ئەم باسەدا دەتوانین هەڵسەنگاندن و بەراوردی جیاوازی و خاڵە وێکچووەکانی نێوان ئەو گروپانە بکەین.

### چەپی ئایدیۆلۆژی

ئەو گروپانەی لە دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زەق بوونەوە هەموویان لە دەوروبەری بابەتەکانی وەکو مافە شارستانییەکان، شەڕی ڤێتنام، فیمینیزم و بابەتە سیاسییەکانی دیکە کۆببوونەوە

و خۆیان ڕێکخستبوو. ئەم گروپانە زۆر بە دیسپلین ڕاهێنرابوون و دەیانتوانی لەگەڵ ئەو بارودۆخەکە بەردەوام لە گۆڕانەدا بوو، خۆبگونجێنن، کە لەکاتی ئەنجامدانی کردەوەکانیان دێتە سەر ڕێیان. سوپای ڕزگارکەری هاوژینەکان (SYMBIONESE LIBERATION ARMY, SLA) و سوپای ڕزگارکەری ڕەشپێستەکان (BLACK LIBERATION ARMY, BLA) و گروپی ژێرزەمینی (WEATHER UNDERGROUND)(کە پێشتر ناوی WEATHERMAN بوو) نموونەی بەرچاوی ئەم گروپانە بوون. لە نێوان ئەم گروپانەدا گروپە ژێرزەمینی بە هۆی کۆمەڵێك ڕووبەڕووبونەوە لە ڕەوتی خۆپیشاندانەکان خۆی لە هەندێك لە شارە گەورەکانی ئەمریکا لە سەرانسەری وڵاتدا زۆر جێگەی سەرنج بوو. فەلسەفەی ئایدیۆلۆژی ئەوان ئامانجی ڕێکخستنەکانی ئەوانی بەڕوونی دەردەخست: ((مەبەستی ئێمە ڕووخاندنی ئیمپراتۆری... چۆك پێ دادان و گوشار خستنە سەر درزەکانە. دەمانەوێت ئاکامی کردەوە خوێناویەکانی لەدژی خەڵکی جیهان بۆ دژوار بکەین. دەمانەوێت پێوەندی بەشۆڕشگێڕانەوە بکەین و لە ناوەوە هێرش بەرینە سەریان))[٦٢]. ئەم گروپە دوای چەندین جار ڕووبەڕووبونەوەی توندوتیژ لەگەڵ پۆلیس بۆ هێرش کردنە سەر باڵەخانەکانی پۆلیس و دادگاکانی کالیفۆڕنیا و نیویۆرك پتر شێوازی نیمچە سەربازییان گرتە بەر[٦٣]. ئەگەرچی ئەم گروپە تا ماوەیەك بە تەواوی مانا ئاشکرا بوو، بەڵام لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٧٠ بە تەواوی ئەوانیان بە گروپی ژێر زەمینی بێ چالاکی دەزانی. بەڵام لە ساڵی ١٩٨١ دا زنجیرەیەك دزیی زۆر توندوتیژی لە نیویۆرك ئەنجام داو دوو پۆلیسی تێدا کوژران. لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە دزی و کوشتارەکان پەیوەندییان بە گروپی ژێر زەمینەوە



(WEATHER UNDERGROUND) هەیە و ئەم گروپە لەگەڵ سوپای ڕزگارکەری ڕەشپێستانیش دۆستایەتی هەیە.

لەو سەردەمەی گروپی ژێر زەمینی لەگەڵ کۆمەڵگا، بەربەرەکانی دەکرد گروپگەلێکی دیکەش بە فەلسەفەی ئایدیۆلۆژی هاوشێوەی ئەوان سەریان هەڵدا. یەکێك لەم گروپانە بەرەی ڕزگارکەری جیهانی نوێ (NEW WORLD LIBERATION FRONT) بوو، کە لە ناوچەی سانفرانسیسکۆ دامەزرا. ئەم گروپە لە هێرش بردنە سەر کۆمپانیا گەورەکان یان باڵەخانە دەوڵەتییەکان، شێوازی پارتیزانی هاوشێوەی لەگەڵ تاکتیکەکانی گروپی ژێر زەمینی پەیڕەو دەکرد. ئەگەرچی بەرەی ڕزگاریخوازی جیهانی نوێ وەکو گروپی ژێر زەمینی ناسراو نەبوو، بەڵام هەندێك لە پسپۆڕان لەو کاتەدا ئەم گروپەیان بە یەکێك لە چالاکترین گروپە تیرۆریستییە ناوخۆییەکانی ئەمریکا دەزانی[٦٤]. لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٨٠ گروپێکی تیرۆریستی تاڕادەیەك ساوا بەناوی بەرەی یەکگرتووی ئازادی (UNITED FREEDOM FRONT) سەریهەڵدا. ئەندامانی ئەم گروپە ژمارەیان زۆر کەم بوو، دەگەیشتە چوار پیاو و سێ ژنی سپیپێست و پیاوێکی ڕەشپێست (٨ کەس) کە زۆربەیان لە دەیەی ١٩٧٠ لەگەڵ گروپەکانی هاوشێوەیان پەیوەندییان هەبوو[٦٥]. بەرەی یەکگرتووی ئازادی جگە لە ژمارەیەك تەقینەوە (دانانەوەی بۆمب) هەروەها لە کوشتنی ژمارەیەك ئەفسەری پۆلیسی ویلایەتی نیوجێرسی و هەوڵی تیرۆری دوو ئەفسەری پۆلیسی ویلایەتی ماساچۆست دەستی هەبوو.

جگە لەو گروپە چەپڕەوانەی لەسەرەوە باسمان کردن و بەزۆرینە سپیپێست بوون، ڕەشپێستە چەپڕەوەکانیش لە تیرۆریزمی ناوخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕۆڵیان نواندووە. سەرەکیترین شوێنی ئەندامگیری بۆ ڕەشپێستە چەپڕەوەکان بەندیخانە بوو. زۆربەی بەندکراوە ڕەشپێستەکان خۆیان بە بەندکراوی سیاسی دەزانی. لە دیدی ئەوانەوە کۆمەڵگا تاوانبارە، چونکە دەرفەتی گونجاوی بۆیان لەبواری خوێندن، نیشتەجێ بوون و کار بۆ نەڕەخساندوون. ئەگەرچی زۆربەی بەندکراوەکان ئەم ڕوانگەیان هەبوو، بەڵام زۆربەیان پشتیوانییان لە کردەوە شۆڕشگێڕییەکان لەدژی کۆمەڵگا نەدەکرد. گروپێکی بچووکی ڕەشپێستەکان روویان کردە ئایدیۆلۆژیای سیاسی مارکسی. ئەم فەلسەفەیە لە بنەڕەتدا پێیوایە ڕەگەزپەرستی گەلاڵەیەکی ئابورییە بە مەبەستی پاراستنی کۆگایەکی بەرفراوان لە هێزی کاری زیادە و ڕێگەگرتن لە ڕاپەڕینی چینی کرێکار. لەسەر ئەم بنەمایە مادام سیستەمی ئابوری و سیاسی دەوڵەت لە سەر بنەمای سەرمایەداری (کاپیتالی)ە ئەوە هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕییەکی گرنگ و پڕ مانا ڕوونادات[٦٦]. لە م رووەوە هەندێك لە ڕێبەرانی شۆڕشگێڕی ڕەشپێست وەکو ڕێبەری پڵینگە ڕەشەکان بە ناوی نیۆتۆن (HUEY NEWTON) کەوتنە بەندیخانەوە. پارتی پڵینگە ڕەشەکان (BLACK PANTHER PARTY) یەکێك لە سەرەتاییترین گروپە سیاسییە ڕەشپێستەکان بوو کە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ دامەزرا. ئەم گروپە خۆی بە ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی مارکسیست دەزانی کە ئامانجەکەی بریتی بوو لە ڕزگارکردنی ڕەشپێستەکان لە سەرکوتکردنی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری



ئەمریکا. لە ڕاستیدا زۆرینەی بەندکراوە نارازی و ژیان تاڵ و چارەڕەشەکان بۆ لای ئەو گروپانە ڕادەکێشن[٦٧].

لە ساڵی ١٩٨٦ دا گروپێکی ڕەشپێستی دیکە بە ناوی ئێل رۆکینز (EL RUKINS) هاتە ناو گۆڕەپانی کردەوە تیرۆریستییەکان. لەم ساڵەدا یەکێك لە ئەندامانی ئەو گروپە ناوبراوە لە مامەڵەیەکی نهێنیدا چەکێکی دژە تانکی کڕی. ئێل رۆکینز لە سەرەتادا دارودەستەی بەندیخانە بوو، ئێستاش خەریکی قاچاغی ماددە سڕکەرەکان و کارە نایاساییەکانی دیکەیە. وتراوە ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەم گروپە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی لیبیا چاوپێکەوتنیان ئەنجامداوە و وا دیارە دەیانەوێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی تیرۆریستی ناوخۆیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەن ئەو دەوڵەتەوە دامەزرێن[٦٨].

## ڕاستی ئایدیۆلۆژی

لەم ساڵانەی دواییدا بەتایبەتی لە دەیەی ١٩٨٠ گروپگەلێکی تیرۆریستی توندوتیژیخواز یان پارێزگار کە بە گروپەکانی نەفرەت (HATE GROUPS)یش بەناوبانگن هەیە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەریانهەڵدا. ئەم جۆرە گروپانە جگە لە ئەنجامدانی کاری توندوتیژی جار جارەش بە ئەنجامدانی کاری ئەوپەڕی تیرۆریستی سەرەکی تر تۆمەتبار کراون. بۆ نموونە، لە ماوەی نێوان کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٥ و حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ لە باشوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ٣٣ کڵێسای ڕەشپێستەکان سوتێنرا و پرسی پاڵنەرە

نەژادییەکانی هێنایە گۆڕێ. لە یەکێك لەم نموونانە لە نامەکەیدا نووسەرەکانی بەرپرسیارێتی ئاگرکەوتنەوەی یەکێك لە هەشت کڵێساکانی (تێنێسی)یان وە ئەستۆ گرتبوو، هەڕەشەی دەستپێکردنی (حکوومەتی ترس)یان کردبوو. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە گومانلێکراوانی سووتاندنی سێ کڵێسای ویلایەتی جۆرجیا لەگەڵ ڕێکخراوی کۆکۆلاکس کلان پێوەندییان هەبوو[٦٩]. ئاگرتێبەردانەکانی کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٩٠ وەبیرهێنەرەوەی شەپۆلێکی هاوشێوەی ئاگرتێبەردانەکانی هاوینی ساڵی ١٩٦٤ بوو. کۆکۆلاکس کلانەکان لەم ئاگرتێبەردانانەدا تەنیا لە میسیسیپی پتر لە ٣٠ کڵێسای ڕەشپێستەکانیان سووتاند. بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئایا لە کۆتاییدا کۆکۆلاکس کلانەکان بەرپرسیاری ئەم ئاگرتێبەردانانە بوون یان ئەندامانی گروپێکی دیکە، ڕوونە ئەم کردەوانە توانیویەتی بەشێکی بەرچاوی ڕەشپێستەکانی ئەمریکا بترسێنێ. زۆربەی گروپە نەفرەتخولقێنەکان بەهۆی هەبوونی ئاڵۆزی و ڕێکخراوی زۆر بەرز وەك گروپەکانی تاوانی ڕێکخراو لەقەڵەمدران. ئەنجوومەنی بەربەرەکانی لەگەڵ بێ ئابڕوویی بەراوردی کردووە ئێستا نزیکەی ٧١ گروپی لەم جۆرە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خەریکی چالاکین. ئەم گروپانە وەك بنەما زۆر بەتوندی چەکدارن و پتر سەرنج دەدەنە پرسگەلێکی وەکو باشتری سپیپێستەکان، نازیزم و چاوپێداخشاندنەوەی ئایین. یەکێك لەو گروپانەی کە ماوەیەکی کورت دوای شەڕە ناوخۆییەکانی ئەمریکا دامەزرا، گروپی کۆکۆلاکس کلان بوو و، ئەم گروپە لە دەیەی ١٩٥٠و دوای دەرکرنی حوکمی دادگای بەرزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەر فایلی گیراوان لە بەرامبەر وەفدی پەروەردە و فێرکردن ( BROWN



V.BOARD OF EDUCATION) سێهەمین خولی ژیانی خۆی دەستپێکرد. ئەم گروپە بەدرێژایی دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ لە زۆربەی ویلایەتەکانی باشوری ئەمریکا ئەندامی زۆریان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا. ئەم گروپە لە بەرزترین ئاستی چالاکییەکانیدا نزیکەی ٧٠٠ لقی ناوچەیی و ١٧ هەزار ئەندامی هەبوو[٧٠]. ئەم ڕێکخراوە زۆر کردەوەی تیرۆریستی جیاوازی وەکو سووتاندنی خاچ، لێدان و بریندارکردن، دانانەوەی بۆمب و کوشتار و هەروەها زۆر کردەوەی دیکە بەمەبەستی تۆقاندنی و بەچۆکداهێنانی خەباتگێڕانی مافە مەدەنییەکانیان ئەنجامداوە. ئەم گروپە وێڕای هەبوونی کۆمەڵێك ڕاوەدوونان و وەدواکەوتنی یاسایی، سەرکەوتووانە کە لە دەیەی ١٩٦٠دا لە ئاستی فیدڕاڵ لە دژی کۆکۆلاکس کلانەکان ئەنجامدرا، هەروا درێژە بە ژیانی دەدا. ساڵی ١٩٨٩ سەربژێری شکۆمەندی (IMPERIAL WIZARD) پێشووی گروپی کۆکۆلاکس کلان بەناوی دەیڤید دوك (DAVID DUKE) لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی یاسادانانی ویلایەتی لویزیانا سەرکەوت. دوك کە بە وتەی خۆی لە سەردەمی خوێندکاریدا نازی بووە، بانگەشەی ئەوە دەکات ساڵی ١٩٧٩ لە گروپی کۆکۆلاکس کلان جیابۆتەوە، بەڵام تا ئەو کاتەی چۆتە ئەنجوومەنی یاسادانانی لویزیانا ماڵەکەی وەکو نووسینگەی ناوچەیی گروپی ناوبراو بەکاردەهات.

## تیرۆریزمی ناوخۆیی: لایەنگرانی بەرزێتی سپیپێستەکان و گروپە نەفرەتخوڵقێنەکان.

ئەو وێنەیەی کە خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە گروپە نەفرەتخوڵقێنەرەکان لە مێشکیاندایە وێنەی کلێشەی سوارچاکانی کۆکۆلاکس کلانە کە شەوانە بە عەبا و دەمامکی سپیەوە خەریکی ئاگرتێبەردانی خاچەکان و کردەوەی درندانەی لەناکاون لە دژی ئەمریکاییە بەرەگەز ئەفریقاییەکانی باشور. بەڵام ئەمرۆکە ئەم وێنەیە ئیتر وێنەی دروستی گروپە تیرۆریستییە میلیشیا و ژێر زەمینییە ڕاستڕەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە[٧١]. لە ڕاستیدا لە دەیەکانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ ژمارەی ئەندامانی گروپی کۆکۆلاکس کلان کەم بۆوە و گروپگەلێکی نوێ و زۆر لەرزۆکی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان لە ناوچە دوورکەوتووەکانی وەکو کالیفۆرنیا، تێگزاز، ئایداهۆ کانتیکات خەریکی سەرهەڵدانن.

ئەم گروپە نوێیە نەفرەتخوڵقێنەرانەش لە ڕوانگەی هەستی ڕق و کینە سەبارەت بە ڕەشپێست و یەهوودییەکان لەگەڵ پێشینانی خۆیان هاوڕابوون، بەڵام لەوان زیاتر خشتەیەکی دوور و درێژیان لە گروپە نەتەوەییەکانی وەکو ئەمریکاییە بە ڕەگەز مەکسیکی و ڤێتنامییەکان بەکۆی نیشانە و ئامانجەکانیان زیاد کردووە. ئیتر ئەم گروپانە خۆیان بە گیرۆدەی شەڕی بەردەوام لە دژی دەوڵەتی فیدراڵ (کە لە حاڵەتی ئاساییدا بە دەوڵەتی داگیرکەری زایۆنیستی "zionist occupational government (ZOG)" لە قەڵەم دەدەن) دەزانن.



ئەگەرچی ئەم گروپانە لە ڕابردوودا قسەوباسەکانیان لە تەوەری ڕەگەزپەرستی دا کۆکردبۆوە، بەڵام ئەمڕۆکە ئامانجەکانیان بەرفرەوانتر کردووە و لە وتارەکانیاندا سیاسەتەکانی کۆچ، ئایدز، تاوانکاری، کشتوکاڵ و دارایی دەدەنە بەر پەلامار. ئەوان هەوڵیانداوە بە بەرفرەوان کردنی بابەتەکانیان لە ناوچە نوێیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەندام کۆبکەنەوە. تیرۆریستە ژێر زەمینییەکانی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان ڕێبەرێکی ناسراویان نییە، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە گروپە بچووکەکان کە زۆربەیان لە دەورەی ڕێبەرێکی شکۆمەند کۆبوونەتەوە لە سەرانسەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاوبوونەتەوە. لێکۆڵێنەوە لە سەر ئەم گروپانە کارێکی ئاستەمە، چونکە دوای ئەوەی دامەزران، زۆربەیان بە یەکەم چاودێری بەرێوبەرانی یاسا بۆ لایان و ناسرانیان، لەبەریەك هەڵدەوشێنەوە و لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی نوێ دووبارە سەرهەڵدەدەنەوە، بەڵام بەبەرفراوان و بڵاوکردنەوەی بابەت و پێگە جوگرافیاییەکەیان هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە کەمتر خۆپیشاندانی جەماوەرییان وەرێدەخست پتر لە ڕابردووش وەك هەڕەشەیەکی تیرۆریستی خۆیان دەرخستووە. گروپە توندڕەوەکانی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان لە سەرەتاکانی دەیەمی ١٩٨٠ لە چالاکییەکانیاندا شێوازێکی میلیشیایی دیاریان گرتەبەر. یەکێك لە ڕێبەرەکانی کۆکۆلاس کلان و نوێنەری گروپی نەتەوەکانی ئاریان (Aryan Nations) بەناوی لوییس بیم (Louis Beam) بۆ ڕاهێنانی لایەنگرەکانی لە بواری تیرۆریستی لە تێگزاز خێوەتگای فێرکردن و ڕاهێنانی میلیشیایی دامەزراند، تا ئەم شێوازانە لە دژی کۆچبەرانی ڤێتنامی بەشدارییان لە پیشەی

پەروەردەکردنی ماسی و ڕاوی قرژاڵی دەریایی تێگزاز بەکار بهێنێ. ویلکنسۆن (Bill Wilkinson) ڕێبەری ئیمپراتۆری نادیاری کۆکۆلاس کلانی ئالاباماش لایەنگرەکانی فێری ڕاهێنانی میلیشیایی دەکرد. گروپەکانی دیکەی سەر بە کۆکۆلاس کلانەکانیش بۆ پەلاماردانی کۆچبەرەکان چەند یەکەیەکی نایاسایی گەشتی سەرسنووریان دامەزراند. جۆرێك فەلسەفەی شۆڕشگێڕانەی توندوتیژ لە پشتەوەی هەموو ئەم جۆرە چالاکیانە هەبوو کە لە کۆکۆلاس کلانەکانەوە بگرە تا گروپەکانی هێزی گەل (Posse Idetity) و گروپە نوێترەکانی "شوناسی مەسیحی" (Christian Idetity) (کە دواتر باسی دەکەین) باوەڕیان پێی هەبوو. ئەم گروپە نەفرەتخوڵقێنەرانە لە ڕاکێشانی جوتیار و کرێکارانی یەخەسپی کە گیرۆدەی خراپی باری ئابووریی ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠بوون، تاڕادەیەك سەرکەوتوو بوون. بزوتنەوەی بەرزێتی سپیپێستەکان ترسی ئەو کەسانەی دەکردە دەسمایە و ئەو گرفتانەی دەخستە ئەستۆی کۆچبەران و کەمایەتییەکان و پیلانگێڕیی بانگەشەییانەی یەهودییەکان لە کۆمەڵگای ماڵی و سیاسی، بۆ وێنە گروپەکانی هێزی گەل، خودی دەوڵەتی فیدراڵیان بە دەوڵەتێکی نایاسایی دەزانی و، لەو باوەڕەدا بوون دەبێ خەڵك تەنیا وەلامدەری پۆلیسی ناوچە بن. بزاڤی شوناسی مەسیحی تەنیا سپیپێستە پاك نەژادەکانی بە مەسیحی ڕاستەقینە دەزانی و بۆ دامەزراندنی نیشتیمانێکی سپی، لایەنگیری لە کۆچی هەموو سپیپێستە مەسحییەکان بۆ ویلایەتەکانی باکوری ڕۆژهەلاتی ئەمریکا دەکرد. توندڕەوە مەسیحییەکان پشتیوانیان لە بزاڤەکانی نەدانی باج دەکرد و خێوەتگای



فێرکردنی چالاکی ملیشیاییان دامەزراند و خۆیان بۆ شۆڕشێکی توندوتیژ ئامادەدەکرد.

لە میانەی دەیەی ١٩٨٠ گروپێکی زۆر توندوتیژخوازی مەسیحییەکان بە ناوی "تاقمی فەرمان" (Order) خەباتێکی ١٨ مانگەی تیرۆریستی بەڕێخست و بە باوەڕی خۆی شۆڕشی سپیپێستەکان و ڕووخانی حکوومەتی داگیرکەری زایۆنیستی لێدەکەوێتەوە. ئەم گروپە لەم خەباتە تیرۆریستییەدا کردەوەگەلێکی وەکو دانانەوەی بۆمب، دزینی ئوتۆمبێلی دژە گوللە، گواستنەوەی پارەوپوڵ بۆ کوشتنی سەربازێك، بەڕێوبەری پۆلیسێك و دوو یاساولی ئێف بی ئای ئەنجامدا. ڕێبەری ئەم تاقمە بە ناوی بۆب متیۆز (Bob Mthews) بەهۆی تەقەی پۆلیس لە ویلایەتی واشینگتۆن کوژرا. تا ساڵی ١٩٨٥ بیست و سێ ئەندامی ئەم تاقمە بە تاوانی جۆراوجۆر دەستبەسەر و حوکمی بەندکردنی درێژخایەنیان بەسەردا سەپێندرا.

بەلام نفووزی گروپی ناوبراو بەهۆی کوژرانی ڕێبەرەکەی و گیرانی لایەنگرە توندوتیژخوازەکانی بە گشتی لەناو چووە. ئەندامە کوژراوەکانی ئەم تاقمە لە ڕوانگەی بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکانەوە بە شەهید لە قەڵەم دەدران و بوونە پاساوی یەکگرتنی کۆکۆلاکس کلانەکان، نیونازییەکان و کەللەسپییە زۆر توندوتیژخوازەکان. بەلام تاقمی ناوبراو دەزگاکانی بەڕێوبەری ئاسایشی سەبارەت بە مەترسیداربوون و هەڕەشەی تیرۆریستی بزاڤی ژێر زەمینی لایەنگری بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکانی ئاگادار کردەوە و کاربەدەستە ناوبراوەکان لە هەندێ

ناوچە بە خێرایی دژی گروپەکانی دیکە هەڵوێستیان وەرگرتووە. سێ ڕێکخراوی گەورەی سەر بە کۆکۆلاکس کلانەکان لە کارۆلینای باکور و ئالاباما بە تۆمەتی ئەنجامدانی تاوان مەحکوم کراون و ناوەندی یاسای هەژاریی باکوریش Sothern Pverty Iaw Center سکالای یاسایی لێکردوون. گروپی "تاقمی فەرمانی٢" (Order 2)، کە گروپێکی نوێ و لە سەر شێوازی تاقمەکەی یەکەم پێکهێنرابوو، دوایی دامەزران، بە خێرایی ناسرا و سەرکوتکرا.

## لەدایکبوونی میلیشیا

چاندنی بۆمب لە باڵەخانەی دەوڵەتی فیدراڵ لە شاری ئۆکلاهۆما، ئەمریکاییەکانی لە بوونی میلیشیایەکی نیمچە سەربازی وەك دیاردەیەکی نوێی گرفتی تاوانە ڕێکخراوەکان ئاگادار کردەوە. ئەندامانی میلیشیا رقێکی زۆریان لە حکوومەت هەیە و لەو باوەڕەدان چەن پیلانێك لە لایەن دەوڵەتەوە لە ئارادایە بۆ داماڵینی چەك لە هاووڵاتیانی ئەمریکا. کاربەدەستە فدراڵییەکان بەپێی ڕوانگەی پیلان کە لە لای میلیشیاکان پەسەندە سەرقاڵی پەسەندکردنی یاسای کۆنترۆڵی چەکن تا بەم شێوەیە دەرەتانی خۆڕاگری لە بەرامبەر داسەپاندنی ڕژێمێکی زۆردار یان دیکتاتۆری "تاك جیهانی" لە خەڵك بستێنن[٧٢]. لەم ڕووەوە ڕێکخەرانی میلیشیا خۆیان بۆ زۆرانبازییەکی چەکدارانە بەباوەڕی خۆیان ئامادەدەکەن.



ساڵی ١٩٩٦ دوو کارەسات ڕوویاندا کە دەستی کەمپە چەکدارەکانی تێدا بوو و ئەم ڕاستییەی دەرخست کە ئەم جۆرە گروپانە لەناو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوونیان هەیە و ڕەنگە هەڕەشەیکی تیرۆریستی بخوڵقێنن. ئەم دوو کارەساتانە یەکیان پێوەندی بە پیاوە ئازادەکانی (Freemen) مۆنتانا و ئەوەی دیکەشیان پێوەندی بە میلشیای ئەمنی (Viper Militia) ئاریزۆنا هەبوو. لە ٢٥ی ئاداری ساڵی ١٩٩٦ لە شاری جۆردەنی ویلایەتی مۆنتانا لە نێوان گروپێکی بچووك، بەڵام زۆر پرچەك بە ناوی پیاوە ئازادەکان و نووسینگەی فیدراڵی (FBI) بەربەستێك بۆ ماوەی ٨١ ڕۆژ دروست بوو. یاساوڵەکانی ئێف بی ئای بڕیاری گرتنی چەند ئەندامێکی ئەم گروپەیان بە تۆمەتی ساختەکاری لە بەڵگەی دارایی لە دەست دا هەبوو. لە ئاکامدا لە ١٣ی حوزەیرانی هەمان ساڵ هەر شازدە کەسەکەی لە گەمارۆی ئێف بی ئای دابوون خۆیان بەدەستەوەدا و ١٢ کەسیان بە تاوانی پێشێل کردنی یاساکانی فیدراڵ مەحکووم کران.

گیرانی ١٢ ئەندامی میلیشای ئەمنی لە یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ لە فێنسکی ئاریزۆنا دووهەمین ڕووداوی ئاگادار کەرەوە بوو لە ئەمریکا. ئەم ڕووداوە لەلایەن کاربەدەستانی فیدراڵ بە کردەوەگەلێکی وەکو داڕشتنی پیلان بۆ تەقاندنەوەی نووسینگە دەوڵەتییەکانی بەڕێوبەرایەتی ئەلکۆل، تەنباکۆ و چەکی گەرم، بەڕێوبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەکان، بەڕێوبەرایەتی کۆچ و وەرگرتنی مافی هاووڵاتی بوون و ئاژانسی پۆلیسی نهێنی لە شاری فنیکس تۆمەتبار کرابوون. گومانباران کە لە ١٠ پیاو و ٢ ژن پێکهاتبوون لە بواری تەقاندنەوەی بۆمبی

نیتراتی ئامۆنیۆم – وەکو ئەو بۆمبەی کە لە تەقینەوەی شاری ئۆکلاهۆما بەکارهاتبوو – راهێنرا بوون.

واپێدەچێ زۆربەی گروپە میلیشیاکان کە بە روالّەت خزیبوونە ناو زۆربەی ناوچە گوندییەکانی ئەمریکا لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٩٠ دامەزرا بن، بەلاّم روون نییە تا چ رادەیەك رۆلّیان هەبووە لە چالاکییە تیرۆریستیەکان. بەپێی زۆربەی مەزندەکان، هەزاران کەس پێوەندییان بە بزاڤی میلیشیاوە هەبووە. بە پێی هەندێك لە بەراوردەکان، زیاتر لە ١٥ هەزار کەسی سەرووی ٤٠ ویلایەت ئەندامی ئەم بزاڤە بوون[٧٣]. ئەم گروپانە سەرەڕای تەمەن کورتیان ناوبانگێکی بێ وێنەیان بەدەستهێناوە. ئەندامانی ئەم گروپانە تەقەیان لە ئەفسەران کردووە و هەڕەشەیان لە کاربەدەستە گشتییەکان کردووە و لە رووبەڕووبوونەوەی چەکدارانەدا گەلێکیان دەستبەسەر کراون.

ئەندامانی ئەم گروپە هەموویان لە شۆفێری بارهەلّگر، ژنانی مالّەوە، پارێزەر، پزیشك، داربڕ و رازێنەرەکان پێکهاتوون و بەو باوەڕە کە ئازادییەکانیان لە مەترسی دایە ئامادەن لەگەلّ حکوومەت شەڕبکەن.

هەندێك لە میلیشیاکان تا سالاّنێك پێوەندی کزیان لەگەلّ گروپە توندڕەوکانی کوکۆلاّس کلاّن، خۆبەختکەرانی بیرشایت (Birchite Minutemen)، ئەنجوومەنی هاوولاّتیە سپیپێستەکان (Whit citizens council) و گروپە نێربازییەکانی وەکو "تاقمی فەرمان" هەبوو، بەلاّم ژمارەیان بەهۆی رەگەزپەرستی و دژە یەهوودییبوونی پرۆگرامەکەیان تارادەیەك توانای گەشە



سنووردار بوو. لەم سالاّنەی دواییدا گروپە ملیشیاکان بەهۆی زالّبوونی بارودۆخی لەرزۆکی ئابووری و نامۆبوون لە سیستەمی سیاسی لە دژی رەوتی سەرەکی کۆمەلّگا راوەستان. مارك کۆپێر (Marc Cooper) پێیوایە بزووتنەوەیەکە کە تا سالاّنێك لە ژێر خۆلّەمێشدا دەمایەوە و بۆ دژکردەوەی دژی بزاڤی مافە شارستانییەکان، لایەنگرانی پاراستنی ژینگە، مافەکانی هۆمۆسێکسوالەکان، بزووتنەوەی لایەنگرانی لەباربردنی کۆرپەلەی یاسایی (Pro-choice Movement) و جلّەوکردنی چەك، لەدایکبوو[٧٤].

## رووداوە دەستپێکەرەکانی بزاڤی میلیشیا

ئەگەرچی ئەو شتانەی لە سەر میلیشیاکان نووسراوە زۆر کۆن نین، بەلاّم لە زۆربەیاندا ئاماژە بە سێ رووداوی دیاری سەرەتاکانی دەیەی ١٩٩٠ کراوە، کە گەشەسەندنی زۆربەی گروپە میلیشیاکانی ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای ئاسان کردووە. رووداوی یەکەم بریتی بوو لە رووبەڕووبوونەوەی یاساولّەکانی دەولّەتی فیدرالّ و یەکێك لە وتاربێژەکانی بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکان بەناوی ریندی وەیڤێر (Randy Weaver) لە رووبی ریچی ویلایەتی ئایداهۆ کە بووە هۆی کوژرانی ژن و مێرمندالّێکی بێ چەکی وەیڤێر لەلایەن یاساولّەکانی فیدرالّ. لەم رووداوەدا یاریدەرێکی مارشالی ویلایەتیش کوژرا، بەلاّم دەستبەجێ دوای ئەم رووداوە وەیڤێر و بنەمالّەکەی بوون بە شەهید و هێمای خۆڕاگری لە بەرامبەر سەرکوتکەرییەکانی حکوومەتی فیدرالّ و تەنانەت گروپێك بە ناوی هاوولاّتیانی

یەکگرتوو بۆ دادپەروەری «United citizens for justice (UCJ)» بە مەبەستی پشتیوانی لە ریندی وەیڤێر دامەزرا. رووداوەکەی دیکە لە نیسانی ساڵی **١٩٩٢** روویدا و، لەم رووداوەدا یاساوڵەکانی دەوڵەتی فیدراڵ شوێنی کۆبوونەوەی ئەندامانی تاقمێکیان بە ناوی لقی داڤیدییەکان «Brach Davidian» لە واکۆی تێگزاز گەمارۆدا. ئەم رووداوە کە رەنگە لە دوو رووداوەکەی دیکە گرینگتر بێ بریتی بوو لە بڕیاردان لەسەر گەلاڵەی ناسراو بە گەلاڵەی برادی «Brady Bill» لە شوباتی ساڵی **١٩٩٤** کە کڕین و فرۆشتنی چەکی گەرمی ملکەچی یاسادەرکرد. لە ئەیلوولی هەمان ساڵ مامەڵەی چەکە هێرشبەرەکانیش قەدەغەکراو باسگەلێکی سیاسی گەرمی ناوە. ئەم رووداوانە پێکەوە پێوەندییەکانی نێوان میلیشیا و یاساییبوونی مامەڵەی چەك و گواستنەوەی وەدەردەخات. لە هەمان ساڵدا بوو کە راندی تراچمێن «Randy Trochman»، میلیشیای مۆنتانای «Militia of Montana (MOM)» کە یەکێك لە گەورەترین گرووپەکانی ئەمریکا لە جۆری خۆیەتی دامەزراند، ئەم گرووپە خەڵکی سەبارەت بە سەقامگیرکردنی لە ناکاوی حکوومەتی سەربازی (میلیتاریزم) و سۆسیالیزمی تاك جیهانی کە لە سەرتاوە مافی هەبوونی چەك لە هاووڵاتیان زەوت دەکات ئاگادار کردەوە[٧٥].

دژایەتی لەگەڵ بزاڤی پاراستنی ژینگە، زانینی رۆڵی میلیشیاکان دژوار دەکات. ئەگەرچی میلیشیاکان لە سەرەتا و ناوەڕاستی دیەی **١٩٩٠** لەگەڵ پۆلیسی ناوچەیی، بەڕێوبەرایەتییەکانی پۆلیس، یاساوڵەکانی بەڕێوبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەکان و کەسانی دیکە چەندین جار رووبەڕووبوونەتەوە، بەڵام لە زۆربەی



ئەو رروداوانەی پێوەندییان بە میلیشیاکانەوە هەبووە دەستی هەندێ کەسی تێدا بووە کە لەلایەکەوە پێوەندییان بە لایەنگرانی پاراستنی ژینگەوە هەبووە. لەم رووەوە زۆربەی گرووپە میلیشیاکان «کە خۆیان بە چالاکانی ئەقڵگەرا دەزانی» جگە لە دژایەتی لەگەڵ باج و یاسا دەوڵەتییەکان، هاوکات لەگەڵ لایەنگری کردن لە مافەکانی خاوەندارێتی لەگەڵ یاساکانی چاکسازی زەوی ناکۆك بوون. ئەم دژایەتییەی ئەوان لەوەوە هەڵدەقوڵێ کە پێیانوابوو گەڵاڵەکانی چاکسازی زەوی هەمان سۆسیالیزمە. بۆ نموونە یەکێك لەم گروپانە لە ویلایەتی واشینگتۆن بە ناوی یەکیتی مافی خاوەندارێتیی بەشی ئیسنۆهۆمیش ( Snohomish country property Rights Alliance (PRA)) کە بانگەشەی ئەوە دەکات ١٠ هەزار ئەندامی هەیە لایەنگری لە خۆڕاگری لە بەرامبەر دەوڵەت و پارێزەرانی ژینگە دەکات. لە کۆتاییەکانی زستانی ١٩٩٤دا کەسە چالاکە ناوچەییەکانی لایەنگری پاراستنی ژینگە لە ویلایەتی واشینگتۆن، نیۆمەکسیکۆ، تێگزاز و مۆنتانا رایانگەیاندووە لەلایەن ئەندامانی گرووپە میلیشیاکان هەڕەشەی کوشتنیان لێکراوە[٧٦]. بزوتنەوەی بەشەکان ( Counties Movement) پێ لەسەر ئەمە دادەگرێ دەبێ بەڕێوبەری پۆلیسی هەر بەشێك مافی ئەوەی هەبێت یاساوڵە فدراڵییەکانی زەوی کە ڕێز لە کولتوور و نەریتی بڕینەوەی دار، دەرهێنانی کانزا و لەوەڕاندنی مەڕەکان لەسەر زەویە گشتییەکان ناگرن، دەستگیر بکات[٧٧].

## گروپە تیرۆریستییە ناوخۆییەکانی دیکە

هەروەکو پێشتر باسمان کرد خستنە ژێر چاودێری هەموو ئەو گروپانەی بزاڤی ژێر زەمینی هەواداری بەرزێتی سپیپێستەکان پێکدەهێنن کارێکی ئاستەمە. ئەم گروپانە بەردەوام خەریکی پێکهاتن، دابەشبوون و دامەزراندنی دووبارەن بە ناوی نوێ و لە شوێنی دیکە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین ئەم گروپانە بۆ هەشت دەستە کە لە ژێرەوە شییان دەکەینەوە، دابەش بکەین.

## گروپەکانی شوناسی مەسیحی

پێڕەوانی بزاڤی شوناسی مەسیحی، ئەو کەسانەی کە بە بنچە یەهوودین ڕاستەوخۆ بە شەیتان دەزانن و تەنیا ئەنگلۆساکسۆنە سپیپێستەکان بە منداڵی خودا لە قەڵەم دەدەن. ئەم گروپانە لایەنگری شەڕی نەژادین و لەو باوەڕەدان تەنیا ئارییە ڕاستەقینەکان لەم شەڕەدا زیندوو دەمێننەوە. ڕێکخراوەکانی بزووتنەوەی شوناس بە گشتی لە چوارچێوەی کلێساکان ڕێکخراون و نەریتی تاڕادەیك وەکو «کلێسای عیسا مەسیح» (Church of Jesus Christ)، و «کلێسای کوێستانی عیسا مەسیح» (Mountain church of Jesus Christ) و «کلێسای مەسیح» (Church of Christ) یان هەیە. تا سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ دەتوانرا کلێساکانی شوناسی مەسیحی لە ٢٣ ویلایەتی ئەمریکا و هەروەها لە کەنەدا، بەریتانیا و ئەفریقای باشوری بدۆزرێنەوە. بزاڤی شوناسی مەسیحی ئەندامانی گروپە نەفرەتخوڵقێنەرە جۆراوجۆرەکانی وەکو کوکۆلاکس کلاّن،



سۆرڤیڤالیستەکان، نیۆنازییەکان و کەللەپێستییەکانی لە ژێر ئاڵای خۆیدا کۆکردۆتەوە. ئەوان لەو باوەڕەدان نە تەنیا تاوانی وەکو سووتاندنی خاچ و هێرشی لە ناکاو ئەنجام نادەن، بەڵکو خەریکی بەجێگەیاندنی فەرمانی ڕاستەقینەی خودان.

کلێسای مەسیحییانی عیسا مەسیح (Church of Jesus Christ Christians) بە ڕێبەرایەتی ریچارد باتلەر (Richard Butler) نموونەیەکی بەرچاو و پڕ نفووزی ئەو کلێسایانەیە کە بانگەشە بۆ شوناسی مەسیحی دەکات و شوێنەکەی لە بنکەی نەتەوە ئارییەکان لە ئایداهۆی باکور هەڵکەوتووە. تۆم ڕۆب (Thom Robb) ڕێبەری جەنگاوەری کوکۆلاکس کلاّنەکان لە هێرسۆنی ئارکانزاکس گروپێکی بەهێزی دیکە لە گروپەکانی شوناسی مەسیحی بەڕێوەدەبات. دەتوانین لقەکانی دیکەی ئەم ئایدۆلۆژیایە لە کلێسای خوداوەند (Church of the Creator) بە ڕێبەری بێن کلاسێن (Ben klassen) لە کارۆلینای باکور و کلێسای خواپەرستە دونیاییەکان (Cosmo theist church) بە ڕێبەری ویلیام پیرس (William pierce) لە ڤێرجینیای ڕۆژئاوا بدۆزینەوە.

## ناسیۆنالیستە سپیپێستەکان

گروپە تیرۆریستییە ناسیۆنالیستە سپیپێستەکان لایەنگری لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ و جیا دەکەن بۆ سپیپێستەکان. هەندێك لەم گروپانە لەگەڵ کلێسای کوێستانی بەڕێبەری ڕۆبێرت مایلز (Robert Miles) لایەنگری

دامەزراندنی نیشتیمانێکن بۆ سپیپێستەکانی ویلایەتەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا. ئەوانی دیکە بۆ وێنە هارۆڵد کاڤینگتۆن (Harold Covington) لە کۆنگرەی کۆنفیدراڵی نەتەوەیی (Confederate National Congress) لەو باوەڕەدایە دەبێ سپیپێستەکان لە دوایین شوێنەکانی باشوری ئەمریکا نیشتیمانێك بۆ خۆیان پێکبهێنن. هەندێ کەسی دیکە وەکو دانیەڵ جانسۆنی (Daniel Johnson) کالیفۆرنیایی خوازیاری چاکسازی لە یاسای بەڕەتی (دەستوری)یە لە پێناو دەرکردنی هەموو پێست ڕەنگینەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ناسیۆنالیستە سپیپێستەکان هەموویان باوەڕیان بە بەرزێتی نەژادی سپییە و گروپەکانی دیکە وەکو یەهودیەکان و ئەو نەژادانەی دیکە کە یەهودییەکان هەوڵدەدەن هەڵیانخەڵەتێنن بە بەدنێو لەقەڵەم دەدن(٧٨).

## بەرزێتیخوازانی سپیپێست: هەڵوێستی سێیەم

تۆم مێتزگێر (Tom Metzger) و گروپە خۆڕاگرەکەی بە ناوی خۆڕاگری ئارياییە سپیپێستەکان (White Aryan Resistance) نکۆڵی لە هەموو هزرە سیاسییە نەریتییەکان دەکەن و لەو باوەڕەدان دەوڵەتی فیدراڵ کە لە ژێر چنگ و دەسەڵاتی یەهوودی و «خیانەتکەرانی نەژادی سپی» دایە سەرەکیترین دوژمنە و دەبێ هێرش بکرێتە سەری. گروپی خۆڕاگری ئارياییە سپیپێستەکان لەسەر بنەمای بڵاوکردنەوەی نەژادپەرستی دوژمنکارییانە و هێرش بۆ سەر ئاسیایی، ئیسپانی، ڕەشپێستەکان و خودی دەوڵەتی ئەمریکا خەریکی ئەندام گیرییە.



گروپێکی هاوشێوەی ئۆکلاهۆما (Oklahoma White's Associatin) سپیپێستەکان بۆ شۆڕش و وەرگرتنەوەی دەوڵەتەکەیان هان دەدات.

## نیۆنازییە کەللە پێستییەکان

تا کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ گروپی ژێر زەمینی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان بە تێکەڵبوونی زنجیرەیەك گروپی نادیار و نەهێندە ڕێکخراو، بەڵام لە ڕادەبەدەر توندوتیژخوازی ناسراو بە کەللەپێستییەکان هەناسەیەکی نوێی هەڵکێشا. کەللەپێستییەکان کۆمەڵێك گەنجی سەرتاشراو بوون کە وێنەی خاچی شکاویان وەك خاڵ لەسەر جەستەیان دەکوتا و چەکمەی نووك کانزاییان لەپێ دەکرد و ئادۆلۆف هیتلەریان وەکو بت دەپەرست. کەللەپێستییەکان بە پێچەوانەی گروپە تیرۆریستییەکانی دیکەی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان لە بنەڕەتدا گروپێکی شارنشین بوون کە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٨٠دا چالاکییە تیرۆریستییە شارییەکان دەستی پێکرد. ئەوان لە سانديagۆ پیرێژنێکی ڕەشپێستیان بریندااریان کرد و لە تامپا، لاس و ڤیگاس و پۆرتلەند پیاوە ڕەشپێستەکانیان کوشتن. ئەوان لەو هێرشە توندوتیژانەش کە لە زۆربەی شارەکانی دیکەی ئەمریکا لە دژی ئەندامانی گروپە کەمایەتییەکانی دیکە و هۆمۆسێکسوالەکان ئەنجام دراون، بەشدارییان کردووە. زۆربەی کەللەپێستییەکان بە شێوازێکی نە زۆر دیسپلیناوی لە ژێر ئاڵای تۆم میتزگێر بە ناوی خۆڕاگری ئارياییە سپیپێستەکان کۆبوونەتەوە.

کەللەپێستییەکان نیۆنازییەکان لە بنەڕەتدا نەفرەتخولقێنەرانی نائایدیۆلۆژیکن کە لە چوارچێوەی نەژادپەرستی دا رێکخراون و پێیانوایە ستراتیژییەتی توندوتیژی لە دژی کەمایەتییەکان، هۆمۆسێکسوالەکان و ژنان و دەوڵەت تەنیا رێگەی چارەسەکردنی گرفتەکانییانە. ئەو توندوتیژییەی لە لایەن کەللەپێستییەکانەوە، ئەنجام دراوە، ئەگەرچی زۆر بەرفراوان و زۆر بووە، بەڵام پتر بە هەڵکەوت بووە و کەمتر وەکو توندوتیژی گروپەکانی دیکە بەرنامەیەکی رێکوپێکی هەبووە.

## کەللەپێستییەکان

لە کۆی ئەو رێکخراوە جۆراوجۆرانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لایەنگری لە بەرزێتی سپیپێستەکان دەکەن، کەللەپێستییەکان یەکێك لە گروپە تازە دامەزراوەکانن. کەللەپێستییەکان کە لە دەیەی ١٩٧٠ لە بەریتانیا سەریان هەڵدا نوێنەری رێکخراوی نیۆفاشیستی بوون و لە کەسانێکی سەرتاشراو و خاوەن پۆشاکی گەنجە بێکار و بەرەڵاکان پێکهاتبوون. ئەگەرچی کەللەپێستییەکان لە ئەوروپا سەریان دەرهێنا، بەڵام بزاڤەکەیان لەگەڵ بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکانی ئەمریکا هاوکات بوو، لەگەڵ گروپەکانی وەکو گروپی نەتەوە ئارییەکان و تاقمی فەرمان هەندێ خاڵی هاوبەشیان هەبوو. بە رواڵەت مەترسیی سەرەکی کەللەپێستییەکان بریتییە لە نفووزی گروپە کۆنەکانی دیکەی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان لە سەریان* ئەندامانی ئەم گروپە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە



لاون لە کەسە بەتەمەنەکانی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان پتر ئامادەیی ئەنجامدانی توندوتیژییان هەیە. هەموو بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کە کەللەپێستییەکان ئەگەرچی گروپێکی لە رادەبەدەر توندوتیژن، بەڵام ژێرخانی رێکخراوەییان نییە و لەو رووەشەوە ناتوانین ئەوان بە پێناسەیەکی تەکنیکی و ورد بە گروپی (تاوانە رێکخراوەکان لەقەڵەم بدەین)***.

## سۆرڤیڤالیستە نەژادپەرستەکان (Racial Survivalists)

سۆرڤیڤالسیتە نەژادپەرستەکان بە زۆری هەمان باوەڕدارانی شوناس مەسیحین کە باوەڕیان بە سەرهەڵدانی ناچارییانەی شەڕێکی نەژادی گەورە هەیە. ئەوان بە پێکهێنانی دەستەگەلێکی میلیشیایی و خوێندنەوەی تاکتیکە تیرۆریستییەکان و کەڵك وەرگرتن لە چەك، ئەم ئایدیۆلۆژییەیان هەنگاوێك بەرەو پێشتر بردووە. گروپی پەیمان و شیر و بازووی خودا (The Covonant, the Sword, and the Arm of the lord "CSA") بەرێبەری جیمس ئەیسۆن (James Ellison) یەکێك لە ناوزڕاوترینی ئەم گروپانەیە.

ئەم گروپە لە ژمارەیەك لە خێوەتگاکانیدا چەکی نایاسایی و کەلوپەلی تەقینەوەی کەڵەکە کردووە و ئامادەکاری پێویستی بۆ مانەوەی خۆی ئەنجام داوە. ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانی گروپی ناوبراو بە تاوانی یارمەتی و بەشداری لە شەڕە تیرۆریستییەکانی تاقمی فەرمان دەستبەسەرکران.

## نەوەی پێنجەمی گروپەکانی کوکۆلاکس کلان:

پێنجەمین نەوەی ئەو گروپانەی باوەڕیان بە بەرزێتی سپیپێستەکان هەیە بە زۆری لە ئەندامانی پێشووی کۆکۆلاکس کلان پێکهاتبوون و لەو باوەڕەدان چالاکی ئاشکرا، رووداوە راگەیاندییەکان و پرۆگرامە چروپڕە فێرکارییەکان جگە لە بەفیڕۆدانی کات قازانجێکی نییە. ئەوان پێیانوایە دەبێ باوەڕداران (ئەوانەی باوەڕیان بە بەرزێتی سپیپێستەکان هەیە) لە جیاتی هەوڵدان بۆ پێکهێنانی گروپێکی ئاشکرای نەفرەتخولقێن خەریکی ئامادەکاری بن بۆ بەشداری لە شەڕێکی پارتیزانی لە دژی دەوڵەت لە ڕێگەی دامەزراندنی چەند گروپێکی بچووك لە شۆڕشگێڕانی راهێنراو و زۆر توندوتیژ. کلێسای کوێستانی رۆبێرت مایێلز یەکێك لە گروپەکانی لایەنگری ئەم فەلسەفەیەیە.

## هێزە ئاسایشە جەماوەرییەکان

بەپێی بانگەشەی گروپەکانی هێزی گەل دەزگا حکوومییە موعتەبەرەکانی بەش تەنیا شوێنی حکوومەتی باوەڕ پێکراوەو، بۆیەش بەڕێوبەری پۆلیسی بەش بەرزترین شوێنی حکوومییە کە دەبێ خەڵك ملکەچی بن. ئەم گروپانە لە بواری میلیشیایی و ئایدیۆلۆژیای سۆرڤیڤالیستەوە رادەهێنرێن، زۆربەیان مەسیحی لایەنگری بزاڤی شوناسیی مەسیحین، زۆربەیان باجە فیدراڵییەکان نادەن و هەندێکیان دادوەرەکانی فیدراڵ و یاساوڵەکانی بەڕێوبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەکانیان داوەتە بەر پەلاماری چالاکییە کوشندەکانیان. گروپە ئاسایشە



جەماوەرییەکان لە دەیەی ١٩٨٠دا هەوڵیان دا بۆ دژکردەوە نیشاندان لە دژی گرفتە داراییەکانی ئەو کاتە کە زۆربەی بنەماڵە جوتیارەکانی گرتبۆوە، جوتیارەکانی ڕۆژئاوای ناڤین بۆ لای خۆیان راکێشن.

## پۆپۆلیستەکان

ژمارەیەك لە گروپە پۆپۆلیستەکانیش لە بنەڕەتدا دژی یەهودییەکانن، پێیانوایە یەهودییەکان هەوساری هۆکارەکانی راگەیاندن و دەوڵەتی ئەمریکایان لە دەستدایە. ئەم گروپانە بەتایبەتی لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای ناڤین دامەزراون و لە بواری ئادیۆلۆژیاوە لەگەڵ ژمارەیەك لە ڕێکخراوە دەستە راستەکانی وەکو هێزە ئاسایشە جەماوەرییەکان، تاقمی فەرمان و گروپی نەتەوە ئارییەکان نزیکایەتییان هەیە. هەموو ئەو گروپانە پێیانوایە نەژادی سپی لە هەموو نەژادەکانی دیکە بەرزترە و لەو باوەڕەدان هەموو رەنگین پێستەکان (بۆ وێنە، یەهوودییەکان) لە بواری ئەقڵی و جەستەیی لە نەژادی سپی لە خوارترن. ئەم گروپانە لە بواری سیاسییەوە لەو باوەڕەدان هەوساری دەوڵەتی فیدراڵ لە دەستی لیبراڵ و یەهوودی و رەشپێستەکان دایە و لەم رووەشەوە نکوڵی لە شەرعییەتی دەوڵەت دەکەن. زۆربەیان پێڕەوی لە فەلسەفەی سۆرڤیڤالیستی دەکەن و دەڵێن دەبێ ئەندامەکانیان خۆیان بۆ شەڕی کۆتایی کە شەڕی نەژادی یان ناوەکییە و بە دڵنیاییەوە دادەگیرسێ، ئامادە بکەن.

ڕێبەری گرووپی نەتەوە ئارییەکانی کڵێسای مەسیحییانی عیسا مەسیح لە ئایداهۆ بەناوی ریچارد باتلەر یەکێکە لە ڕێبەرانی نیۆنازیی. گرووپی نەتەوە ئارییەکان لەگەڵ گرووپە هاوشێوەکانی، کە خاچی شکاو لەمل دەکەن و بە بەکارهێنەرانی نیشانەکانی دیکەی نازییە هیتلەرییەکان بەناوبانگن پێوەندییان هەیە. تاقمی فەرمان یەکێك لە گرووپە نێو نازیەکانی دەیەی ١٩٨٠ بووە، ئەم گرووپە کە لە گرووپەکانی دیکە توندوتیژتر بوو لە گرووپە نەتەوە ئارییەکان جیا بۆتەوە و لەلایەن رۆبێرت میتیۆزی نووسەری پەرتووکی بیرەوەرییە ڕۆژانەییەکانی تێرنێر (The Turner Diaries) بەشی هەرە زۆری فەلسەفەی ئەم گرووپە لە کتێبی میتیۆز وەرگیراوە کە تێیدا وێنەی شەڕێکی نەژادیی خەیاڵی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ڕێبەری گوردانێکی سەربازی سەربڕێر و نهێنی بەناوی (تاقم) کێشراوە، کە بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی فیدراڵ و دامەزراندنی دەوڵەتێك لەسەر بنەمای بەرزێتی سپیپێستەکان ڕێکخراوە. ئەندامانی ئەم تاقمە لە سەرەتاکانی ١٩٨٠دا لە هەندێك تاوانی وەکو دزی، ساختەکاری، دانانەوەی بۆمب، پەلاماردانی کاربەدەستە فیدراڵییەکان و کوشتنی میوانێکی بەرنامەی تەلەفزیۆنی و وتووێژی دێنڤێر بەشدارییان کردووە.

گرووپێکی گرینگی دیکەی دەستە ڕاستی کە باوەڕی بە سۆرڤالیستی هەیە ناوی پەیمان، شیر و بازووی خودایە. ئەم گرووپە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٨٠ دامەزراوە. ئەندامانی ئەم گرووپە ژمارەیەك تەقینەوە و ئاگرتێبەردان و دەستدرێژی و کوشتنی سەربازێکی ویلایەتی میسیپی و سەربازێکی ویلایەتی ئارکانزاسیان ئەنجام داوە. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٥ بنکەی ئەم گرووپە لە



نزیکی هێریسۆنی ئارکانزاس کەوتە بەر هێرشی یاساوڵە فیدراڵییەکان. لەو هێرشەدا چەند ئەندامی ئەو گرووپە و ٤ ئەندامی تاقمی فەرمان دەستبەسەرکران و گیراوەکان دواتر بەتاوانبار ناسران.

ڕێکخراوی هێزی گەل کە لە ڕۆژئاوای ناڤین چالاکی دەنوێنێت نوێنەری گرووپێکی دیکەیە لە توندڕەوەکانی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان و شوناسێکی بەهێزی مەسیحی هەیە و دژی دانی باجە. ئەندامانی ئەم گرووپە هەروەها دەستییان هەبووە لە کوشتنی ئەفسەرانی پۆلیسی ئارکانزاس و نیبراسکا و ئەمەش بەناوبانگە لەگەڵ ئەو کەسانەی زەویەکانییان بەهۆی کرێنەدانی جوتیارەکان زەوت کردووە، ڕووبەڕوو بوونەتەوە. ئەندامانی ئەو گرووپەش لەو باوەڕەدان یەهوودییەکان دەوڵەتی ئەمریکایان پاوان کردووە و دەبێ گەل بگەڕێتەوە سەر بنچینەکانی ئەنگلوساکسۆنی خۆی. لە ڕوانگەی ئەندامانی ئەم گرووپە یەکێك لە ڕێگاکانی دژایەتی لەگەڵ یەهوودییەکان و دەوڵەتی ئێستای ویلایەتە یەکگرتووەکان بریتییە لە لایەنگری لە نەدانی باج. ڕوانگەکانی ئەم گرووپە ئەگەرچی بێ پێناسە و نەناسراون، بەڵام هەڕەشەیەکی بنەڕەتین بۆ سەر دیسپلینی گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

دەبێ لە بیرمان بێ یەکێك لەو تیۆرانەی تەقینەوەکانی شاری ئۆکلاهۆما ڕووندەکاتەوە ئەوەیە کە جوداییخوازانی دژی دەوڵەتی فیدراڵ سوود لە کردەوە تیرۆریستیەکان وەك ئامێرێك بۆ دژایەتی کۆمەڵایەتی وەردەگرن. لە سەر ئەم بنەمایە جارێکی دیکە دەبینین تیرۆریستەکان تەنیا لە فێندامێنتاڵە

ئیسلامیەکان پێکنەهاتوون و خراپتر ئەوەیە کە ناسینی توندڕەوانی ناوخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاستەم بێت.

بزووتنەوەی گروپەکانی باوەڕدار بەبەرزێتی سپیپێستەکانی گرنگە بۆ سەر یاسا و دیسپلینی کۆمەڵگای ئەمریکا و، ئەگەرچی وادێتە بەرچاو کە هەوڵە قورسەکانی بەڕێوەبەرایەتی یاسا توانیبێتی چالاکییەکانی ئەوان سەرکوت بکات، بەڵام هێشتاش لە ناوخۆی ئەمریکا زۆر گروپی لەم بابەتە خەریکی چالاکین. جگە لەوەی ئەم گروپانە باوەڕێکی نەژادپەرستانە و، جارجارە مارکسیستانەیان هەیە، بەڵام زۆربەیان پێیانوایە یاساکانی فیدراڵی ویلایەتی دژی یاسای بنەڕەتین. ئەوان لایەنگری نەدانی باجن و پێیانوایە پۆلیسی ویلایەتی و ناوچەیی (جگە لە بەڕێوەبەرانی پۆلیس) هیچ شەرعییەتێکیان نییە.

## چالاکییە تیرۆریستییە یەك مەبەستەکان

شمێد (Schmid) و دووگراف (Degraaf) سەرەڕای گروپە توندڕەوە دەستە ڕاستییە ناوخۆیەکان بەمەبەستی ئەنجامدانی چالاکییە تیرۆریستیە یەك مەبەستەکان (Single-issue terrorist activity) لاپەڕەیەکی جیایان کردۆتەوە[٧٩]. ئەم جۆرە لە تیرۆریزم لەلایەن گروپگەلێکی بچووك یان کەسانێکەوە ئەنجام دەدرێن کە بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیاز بەقازانجی گروپێکی گەورەتر کە خۆی بە هاوپەیمانی دەزانێ گوشار دەخەنە سەر کاربەدەستەکان. لەم



ساڵانەی دواییدا کۆمەڵێك کاری تیرۆریستی ئەنجام دراوە، کە دەستی تیرۆریزمی یەك مەبەستەی تێدابووە. لەژێرەوە هەندێك نموونە دەهێنینەوە.

## چالاکی دژی لەباربردنی کۆرپەلە

لە کانوونی دووەمی ١٩٩٥ پیاوێکی چەکدار هێرشی کردە سەر کلینیکێکی لەباربردنی کۆرپەلە لە برۆکلینی ماساچۆست و ٧ کەسی وەبەر گوللەدا. دوو کەس لە قوربانییەکان کە بەرپرسی وەرگرتنی کلینیك بوون، کوژران. دوای گیرانی ئەم پیاوە چەکدارە کە ناوی سالڤی (John salvi) بوو ئەندامانی بزاڤی پاریزگاری لە ژیان (pro-life movement) بە مەبەستی لایەنگری لەو، ڕێوڕەسمێکی شەونخوونیان لە بۆستۆن پێکهێنا. ئەگەرچی ئەم ڕووداوە هەموو ئەمریکای هەژاند، بەڵام لە کوشتارەکانی دیکەی ئەم ساڵانەی دوایی ناو کلینیکەکانی لەباربردنی کۆرپەلە دەچوو. ئەو تیرۆرانەی پەیوەندییان بە پرسی لەباربردنی کۆرپەلەوە هەیە، تازە باو ببوون. یەکەمین حاڵەت بریتی بوو لە کوشتنی پسپۆڕێکی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڤیچیپتای کانزاس کە لە لایەن کەسێك لە چالاکانی گروپی پاراستنی ژیان بەناوی پۆڵ هیل (Paul hill) تەقەی لێکرا. ئێستا تەقەکەرەکە بە تاوانی ئەنجامدانی ئەم کارە زیندانی هەتاهەتاییە. ڕووداوی دواتر لە ساڵی ١٩٩٣ ڕوویدا و پزیشکێك بە ناوی دیڤید گون ( David Gunn) (لەگەڵ کەسێك کە بەخواستی خۆی پارێزگاری لێدەکرد) لە کاتێکدا لە بەردەم کلینیکی خزمەتگوزاری پزیشکی بۆ ژنان لە پێنسا کۆلای فلۆریدا لەناو

ئوتومبێلەکەی دانیشتبوو، چەند گوللەیەکی لێدرا. تەقەکەرەکە ناوی مایکڵ گریفین (Michael griffin) و یەکێك لە چالاکانی دژی لەباربردنی کۆرپەلە بوو بە تاوانی ئەنجامدانی کوشتنی بە ئەنقەست مەحکووم کرا. تیرۆریستەکانی دژی لەباربردنی کۆرپەلە لە ماوەی نێوان ساڵەکانی **١٩٨٢** و **١٩٨٦** پتر لە چل کلینیکی کۆنترۆڵ کردنی زایین و لەناوبردنی کۆرپەلەیان بۆمبڕێژی کردووە[٨٠]. تیرۆریستەکان جگە لە توندوتیژی کەڵك لە ترسیش وەردەگرن. ئەو نەخۆشانەی ویستوویانە سەردانی ئەم کلینیکانە بکەن و هەروەها ئەو پزیشك و کەسانەی خزمەتگوزاریی لەناوبردنی کۆرپەلەیان پێشکەشکردووە کەوتوونەتە بەر ئازار و ئەشکەنجەی ئەوانەوە. ئەمانە مستێك لە خەرواری ئەو رووداوانەیە کە لەم ساڵانەی دواییدا لەملاوئەولای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا روویداوە.

کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی **١٩٩٣** یاسای ئازادیی هاتوچۆ بۆ کلینیکەکانی لە سەرانسەری وڵات پەسەند کرد. دەوڵەت ئەم کارەی بۆ ئەوە ئەنجام دا تا ژنان بتوانن بەبێ ترس لە ئازار و ئەشکەنجەی تیرۆریستان سەردانی ئەو کلینیکانە بکەن. سەپاندنی توندوتیژی و توندوتیژی رێکخراو بەدژی کلینیکەکانی لەباربردنی کۆرپەلە بەڕادەیەکی زۆر سەرنجی پۆلیس و کۆمەڵگای بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. دەتوانین بڵێین ئەو وتارە توندوتیژانەی بە گشتی لە کۆبوونەوەکانی بەرهەڵستکارانی لەباربردنی کۆرپەلە دەخوێندرایەوە هەڵڕەخسێن و ئاسانکەرەوەی پەنابردنە بەر زەبروزەنگن. کاتێك سەرنج بدەینە ئەوەی کە لە تەواوکەری یەکەمی یاسای بنەڕەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (ئازادی ڕادەربڕین) تەنانەت پشتیوانیکراوە لە



ناشیرینترین قسە و هەندێك لە شێوازەکانی رادەربڕینی سەمبولێکی وەکو ئاگردانی ئاڵاکراوە لەگەڵ تەنگژەیەکی فەلسەفیی تایبەت رووبەڕوو دەبینەوە، بەڵام هەندێ کەس وتوویانە چەتری پشتیوانی یاسای بنەڕەتی کە هەموو جۆرەکانی دەربڕینی روانگە لە توندوتیژی لە فیلمە تەلەفزیۆنییەکانەوە بگرە تا نیشاندانی پرۆنۆگرافی و (وتاری بانگەشە بۆ نەفرەت) دەگرێتەوە، بزوێنەری ئەنجامدانی کردەوەی زیانبار و دەبێ سنووردار بکرێ[٨١]. بەڵام دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە گشتی ئەو هەوڵانەی کە بۆ جیاکردنەوەی ئەو شێوازانەی دەربڕین ئەنجامدراوە، رەتکردۆتەوە و بەم شێوەیە بواری بۆ وتاری بەتینتر لەو خۆپیشاندانەی بەمەبەستی دژایەتی کردنی لەباربردنی کۆرپلە ئەنجام دەدرا (تەنانەت هانی ئەم قسانەی داوە) رەخساندووە. ئەم پرسەیە بە تایبەتی لە ساڵی **١٩٩٢** دەبینرێ. لەو ساڵەدا دادوەرەکانی دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکان لە دوای ئار.ئای.ڤی لە بەرامبەر سێنت پۆل بەتێکڕای دەنگ ئەو حوکمەی کە لە شاری سێنت پۆلی مینێسووتا بۆ مەحکووم کردنی کردەوەی تازە لاوێکی سپیپێست دەرکرابوو، رەدکردەوە. ئەم تازە لاوە خاچێکی لەناو حەساری ماڵی بنەماڵەیەکی رەشپێست سووتاندبوو. زۆربەی دادوەرەکان پێیانوابوو یاسا بە ڕاشکاوی باسی دەرەتانی لێپێچینەوەی قەزایی کردووە سەبارەت بە چەند جۆرێکی دیاریکراوی رادەربڕین وەکو سووکایەتی نەژادی، ئایینی و رەگەزی. لە بڕیاری دادگای باڵادا هاتبوو: «تەواوکەری یەکەمی یاسای بنەڕەتی مۆڵەتی ئەوە نادات بە کاربەدەستانی سێنت پۆل رێگە لەو وتاربێژانە بگرن کە لە سەر بابەتی ناخۆش ڕادەردەبڕن». دوای دەرچوونی ئەم بڕیارە زۆربەی خەڵك ئەویان بە خاڵی

کۆتایی هەموو ئەو یاسایانە دەزانی کە چاودێری وتاربێژی لە کۆبوونەوەکان و زۆربەی هەوڵە یاساییەکانی داهاتوو بوو سەبارەت بەو تاوانانەی لە سەر نەفرەتخولقێنی دامەزرا بوون.

## رووداوە تاوانکارییەکان

بەهۆی ئەوەی کە کردەوە توندوتیژەکانی پەیوەست بە پرسی لەباربردنی کۆرپەلە تارادیەك بۆ کۆمەڵگا نوێن، پسپۆڕان هێشتا روانگەیەکی روونیان لەم بارەیەوە نییە. ئایا ئەم کردەوانە بە تاوانی رێکخراو لە قەڵەم دەدرێن یان نا؟ هەڵبەت کاربەدەستە فیدراڵییەکان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر لە جاران باوەڕ بەوە دەهێنن کە ئەم کارانە دەچنە چوارچێوەی پێناسەیەکەوە کە لە پێشڕەوی رێکۆدا لە رێکخستنێکی تاوان کراوە. زۆربەی چالاکانی دژی لەباربردنی کۆرپەلە پەیڕەوی لە فەلسەفەی فەندەمێنتاڵی مەسیحی دەکەن. ئەو بابەتەی دەبێتە هۆی ئاڵۆزبوونی بابەتەکە ئەوەیە ئایا ئەم کردەوانە نیشاندەری ئاکاری تاوانکارییانەی رێکخراوە یان تەنیا روداوگەلێکی لێك جیاوازە لە لایەن کۆنەپەرستە جیاجیاکانەوە ئەنجام دەدرێ. لە ساڵی ۱۹۹۳ دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رایگەیاند دەتوانرێ لە پێشڕەوی ریکۆ سەبارەت بە تاوانە رێکخراوەکان بۆ جڵەوکردنی هەندێ لەو کردەوە توندتیژانەی بۆ دژایەتی لەباربردنی کۆرپەلە ئەنجام دەدرێ کەڵك وەربگیرێ. وادێتە بەرچاو بەشی زۆری ئەو کردەوە توندوتیژانەی توندڕەوەکان ئەنجامیان داوە کاری کەسە جیاجیاکانە، بەڵام ئێلێن



گوودمەن (Ellen Goodman) لەو باوەڕەدایە: «ئەگەر ئەو کردەوە توندوتیژانە تەنیا کردەوەگەلێك بن کە لە لایەن کەسانی خەمۆك و جیاجیا ئەنجام دراون ئەی بۆ پێکهاتنی پیلانێك چەند کەسی خەمۆکی پێویستە؟ دەبێ چەند کەسی سەرلێشێواومان هەبێ تا بزوتنەوەیەك سەربگرێت»[۸۲].

بە درێژایی دەیەی ۱۹۸۰ دانانەوەی بۆمب هێدی هێدی جێگەی هەڕەشەی کوشتن و بۆسەنانەوەی گرتەوە. سەرەتا برینداركردنی پزیشکێك رێگەی کردەوە بۆ کوشتنی پزیشکێکی دیکە. هەموو لایەنگرانی بزاڤی پاراستنی ژیان بەکردەوە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، بکوژەکان کەسانی گۆشەگیرن یان لە دەرەوەی بزووتنەوەکەن. ئەم بانگەشەیەی رەوتی سەرەکیی بزاڤی پاراستنی ژیان کە دەیوت لەباربردنی کۆرپەلە هەرهەمان قەتڵە هێدی هێدی بەشێکی زۆری لە خەڵك بەم دەرئەنجامە گەیاند کە کوشتنی مرۆڤ تاوانێکە دەتوانرێ پاساوی بۆ بهێندرێتەوە و ئەو کوشتنەی بۆ رێگرتن لە مرۆڤ کوژی ئەنجام دەدرێ لە بواری رەوشتییەوە دروستە[۸۳]. بە دڵنیاییەوە ئەم روانگانە بنچینە کۆنەکانی یاسای بنەڕەتی پشتگوێ دەخات سەبارەت بە تێپەڕکردنی قۆناغە یاساییەکانی.

ڕۆژنامەی واشینگتۆن پۆست لە ئاداری ساڵی ۱۹۹۳ رایگەیاند کۆمیتەی مافی ژیان (Right to Life Committee) هەم زیادبوونی ئەندامەکانی و هەم چڕترکردنی بەشداری و چالاکییەکانی راگەیاندووە. ئەگەرچی ئەم رێکخراوە بە فەرمی ستراتیژی چاودێری کردنی ماڵی پزیشکەکانی نەگرتۆتەبەر، بەڵام پاڵپشتی لەو کەسە جیاجیایانە دەکات کە ئەم کارە ئەنجام دەدەن. هیچ کام لە

گروپەکانی لایەنگری بزاڤی پاراستنی ژیان لە بەرامبەر ئەو توندوتیژییەی لە ساڵی ١٩٩٤ ئەنجام درا خەمسارد نەبوون، بەڵام هەندێك لە لایەنگرەکانیان پاڵپشتییان لێکرد، بۆ نموونە دوای گیرانی جان سالڤی بە تاوانی دەستدرێژی بۆستون یەکێك لەو پیاوانەی بۆ پاڵپشتی لەو رێورەسمەی شەونخوونی بەشداری کردبوو، بە بڵندگۆ هاواری کرد: «بۆچی ژیانی بەرێوبەری وەرگرتنی ناوەندێکی لەباربردنی کۆرپەلە بەنرخترە لە ژیانی پەنجا منداڵی بێ تاوان»[٨٤].

ئەم گومانە لە ئارادایە کاربەدەستە فیدراڵییەکان ئەگەری بوونی پێوەندییەکی پیلانگێڕانە لە نێوان ئەو توندوتیژییانەی پێوەندییان بە لەباربردنی کۆرپەلەوە هەیە رەتناکەنەوە. لە ڕاستیدا وەزارەتی دادی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٣ سەبارەت بە ئەگەری بە هەڵکەوتنەبوونی(عدم صدفە) بەرزبوونەوەی توندوتیژی لە دژی ناوەندەکانی لەباربردنی کۆرپەلە دەستی کردووە بە لێکۆڵینەوە[٨٥]. هۆکاری دڵنیابوونی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە تیۆری پیلانە راگەیێندراوێکی ٢ بەندیە کە لە لایەن پۆل هیل (ئەنجامدەری دەستڕێژی لە فلۆریدا)یەوە نووسراوە و ٢٩ کەسی لە چالاکانی بزاڤی پاراستنی ژیان واژۆیان کردووە. لەم راگەیێندراوەدا نووسراوە: «ئێمە واژۆکەرانی ژێرەوە رادەگەیێنین هەر جۆرە هەوڵێکی خوداپەرستانەی پێویست بۆ پاراستنی ژیانی هەموو مرۆڤەکان بۆ نموونە بەکارهێنانی هێز بە دادپەروەرانە دەزانین...ئێمە ڕادەگەیێنین هەروەکو بەکارهێنانی هێز بۆ پاراستنی ژیانی منداڵێکی لەدایکبوو شەرعییە، بۆ پاراستنی ژیانی منداڵێکی لەدایکنەبووش هەر شەرعییەتی هەیە»[٨٦].



ئەم راگەیێندراوە باسی ئەوە دەکات بەلانی کەمەوە ژمارەیەك لە لایەنگرانی بزاڤی پاراستنی ژیان بۆ توندوتیژی خولقێنی جۆرێك مافی رێکخستنی بۆ خۆیان بەرەوا دەزانن. بەڵام هێشتاش روون نییە ئەم مافە تا چ رادەیەك دەبێتە هۆی رەوایی و راسپاردنی کەسەکان بۆ توندوتیژی خولقێنی. جگە لەمە کاربەدەستانی جێبەجێ کردنی یاسا سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم جۆرە تاوانە لەگەڵ تەنگژەیەکی زۆر بەرەو روون.

## رۆڵی راگەیاندن لە تیرۆریزمدا

تیرۆریزم چ ناوخۆیی بێت یان نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی کاریگەری هەبێ پێویستی بە جۆرێك لە پڕوپاگەندەیە. یەکێك لە هۆکارەکانی زیادبوونی کردەوە تیرۆریستییەکان بریتییە لە مەودایەکی بەرفراوانی پڕوپاگەندە، کە کاریگەری لەسەر بەشێکی بەرفراوانی خەڵکی ناوخۆی وڵات و هەندێ جار هەموو جیهان هەیە. تیرۆریستان راگەیاندن بە ڕێگای گواستنەوەی پەیامەکانیان بۆ سەرانسەری جیهان دەزانن. هەتا کردەوەی بوێرانەتر و توندوتیژی بەرچاوتربێ، راگەیاندن کاردانەوەیەکی بەهێزتری لەناو هەواڵەکاندا دەبێ.

ئەگەرچی بەشێکی زۆر لە خەڵك لەو باوەڕەدان تیرۆریستان سوود لە راگەیاندنەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان وەردەگرن و، راگەیاندنەکان بە گشتی رووداوەکان هەژێنەر و زۆر گەورەتر لە راستی نیشان دەدەن، بەڵام مافی ئازادیی رادەربڕین و چاپەمەنیش گرێنتی دەکەن. کردەوە تیرۆریستییەکان بە گشتی نرخی

ئەوەیان هەیە ببنە هەواڵ و، کارگێڕانی ڕاگەیاندن پێیانوایە ڕەنگدانەوەی ئەم کردەوانە لە هەواڵەکاندا ئەرکی کاری ئەوانە و ڕکابەرایەتییەکی توندی لە سەرە. ژمارەیەکیان پێیانوایە ڕەنگدانەوەی ڕووداوە تیرۆریستییەکان لە هەواڵەکاندا یارمەتی چارەسەرکردنی ئەم ڕووداوانە دەدا و نیشاندانی وێنەی بارمتەکان لە تەلەفزیۆن بە کردەوە دەتوانێ ببێتە هۆی ڕزگاری ئەوان. لە لایەکی دیکەوە ئەو زانیارییە لە ناکاو و نادروستانەی ڕاگەیاندنەکان بڵاوی دەکەنەوە تەنیا دەتوانێ ڕێگە لە چارەسەرکردنی ڕووداوێکی تیرۆریستی بگرێ،ئەو ئیختیاراتانەی لەبەردەستدایە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵی سنووردار بکات یان بە کردەوە زانیاریی نهێنی بەنرخ دەخاتە بەردەستی تیرۆریستان.

## جڵەوکردنی تیرۆریزم

ریچارد نیکسۆنی سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵی ١٩٧٢ کۆمیتەی بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزمی ( Commitlee to Combat Terrorism) دامەزراند. ئەمە یەکەمین هەوڵی فەرمیی دەوڵەتی ئەمریکا بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تیرۆریزم لە ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکان. بەداخەوە هیچکام لە یاسا فیدراڵییەکان بە شێوەیەکی دیاریکراو باسی کێشەی تیرۆریزم ناکەن و ڕۆڵی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (ئێف. بی. ئای) و ڕێکخراوی ناوەندیی هەواڵگری (سی. ئای. ئەی) لە ڕووی خۆخزاندنە بۆ ناو گروپە تیرۆریستییەکان زۆر سنوورداره. هاوکاری و ڕێککەوتنە نێو



دەوڵەتییەکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزم وەکو دیارە حاڵەتی تاکانەن. لەلایەنی ناوخۆییەوە، هەم ڕێکخراوەفیدراڵییەکانی جێبەجێکەری یاساو هەم سوپا دەستەگەلێکیدژایەتیکردنی تیرۆریزمیان دامەزراندووە. یەکێك لە دەستەکانی بەناوی دێلتا فۆرس زۆر بەناوبانگە و ئەندامەکانی بەسەر چوار ڕیزی سەربازی دابەش کراون. لە بنەڕەتدا چالاکییەکانی دێلتا فۆرس نهێنین، بەڵام لە ئێران (١٩٨٠)، هیندۆراس (١٩٨٢)، سودان (١٩٨٣) و لە ڕووی هێرشی گرانادا (١٩٨٣) چالاکی ئەنجامداوە و ساڵی ١٩٨٣ ئەندامەکانی ئامادەی ئەنجامدانی ئۆپراسیۆن بوون لەدژی ڕفێنەرانی پاپۆڕی ئاکلیلێ لائۆ[٨٧]. دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە ئەگەرچی دێلتا فۆرس ڕێکخراوێکی ئاسایشی گشتی نییە، ڕەنگە هێزەکانی پۆلیسی سەدەی بیست و یەکەم بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو پرسە نێودەوڵەتییانەی کاریگەرییان هەیە لەسەر پاراستنی ئاسایشی ناوخۆیی لەگەڵ ژمارەیەك لە لقەکانی سۆپا بە شێوازی نوێ بەشداری بکەن.

## گەلاڵەی دژە تیرۆریستی ١٩٩٦

یەکێك لەو پێشکەوتنانەی کە بەم زووانە لە پرسی بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزم بەدەستهاتووە بریتییە لە واژۆی گەلاڵەی دژە تیرۆریستی فیدراڵی لە ٢٤ی نیسانی ١٩٩٦ لەلایەن کلینتۆنی سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا و، بەیاساییبوونی. ئەم یاسایە لە یەکەمین ساڵوەگەڕی کارەساتی تەقینەوەی بۆمب لە شاری ئۆکلاهۆما واژۆ کرا و مشتومڕێکی بەرچاوی لە نێوان دیموکرات و

کۆماریخوازەکاندا هەڵگیرساند، بەڵام دارِشتنە کۆتاییەکەی هەندێك ڕێوشوێنی گرنگی تێدا بوو. بۆ وێنە ئەم گەڵاڵەیە بڕیاردەدات لەسەر سنورداریگەلێکی بەرفراوان بۆ رزگاری ئەو بەندکراوانەی بەپێی یاسای ویلایەتی یان فیدراڵییەکان بە سزای لە سێدارەدان مەحکووم کراون. بەپێی ئەم یاسایە بەندکراوان پاش دوایین کۆبوونەوەی دادگای ویلایەتی دەتوانن لە ماوەی شەش مانگدا گازاندەکانیان بە نووسراو بۆ چاوپێداخشاندنەوەی حوکمی دەرکراو، تۆمار بکەن. جگە لەمە گەڵاڵەکە ڕێگە بە دەوڵەتی فیدراڵ دەدات مافی هاتنە ژوورەوە بۆ ناوخۆی وڵات لەو بیانیانەی ئەندامی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانن زەوت بکات. هەروەها دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ گەڕاندنەوەی ئەو بیانیانەی گۆمانی پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانیان لێدەکرێ، بەرفراوانتر بووە. بەندەکانی دیکەی گەڵاڵەی ساڵی ١٩٩٦ بریتین لە:

- هەرکەس بۆ ئەو گروپانەی گومانی ئەنجامدانی کردەوەی تیرۆریستیان لێدەکرێ پارە کۆبکاتەوە یان لە بواری دارایی یارمەتیان بدات تووشی لێپێچینەوەی یاسایی دەبێت.
- بەرهەمهێنەرانی ماددەی تەقینەوەی پەلاستیکی دەبێ لە بەرهەمەکانیان فاکتەری دەستنیشانکراو بەکار بێنن بۆ ئەوەی بتوانرێ ئەم ماددانە بناسرێنەوە.
- ئەو تاوانبارانەی بە پێی یاسا فیدراڵییەکان مەحکوم کراون، دەبێ لە زۆربەی حاڵەتەکاندا غەرامە بدەن بە قوربانییەکانیان.

ئەگەرچی بەشی زۆری خەڵك یاسای ساڵی ١٩٩٦ بە ئامرازێکی گونجاو بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزم دەزانن، بەڵام هەڵکشانی کارەساتە تیرۆریستییەکان چ لە ناوخۆ و چ لە دەوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆمەڵێك دوودڵی لە سەر شوێنەواری ڕێگری ئەم یاسایە دروستکردووە. لە ڕاستیدا کاتێك ئەوکارە توندوتیژانەی ناتوانرێت پاساو بدرێن،



پاڵنەری لەگەڵ ئامانجی سیاسی هاوکات دەبن، بە ئاستەم دەتوانین پێشبینی بکەین کام پلان لە کۆتاییدا لە هەموویان کاریگەتر دەبێ!!.

ڕۆژمێری کارەساتە تیرۆریستییەکانی دەیەی ١٩٨٠ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بزاڤی باوەڕ بە بەرزێتی سپیپێستەکاندەستی تێدا بوو.

- ١٤ ئایاری ساڵی ١٩٨٠: جی.بی.ستۆنێر (J.B.Stoner) ی ئەندامی گروپی جیهاد لەدژی گەندەڵی(Crusade Against Corruption) بە تاوانی تەقاندنەوەی کلێسایەك لە بیرمەنگامی ئالاباما مەحکووم کرا.
- ٢٠ ئابی ١٩٨٠: دوو راکەری رەشپێست کەوتنە بۆسەیەکەوە لە پارکی ساڵت لێك سیتی (Salt Lake City) بە چەند گوللەیەك کوژران. یەکێك لە نیونازییەکان بەناوی ژۆزێف پۆل فرانکلین (Joseph Paul Franklin) کە پێشینەیەکی بەرزی لە تاوانکاری هەبوو، لە سەر ئەنجامدانی ئەم تاوانە مەحکووم کرا.
- کانوونی دووەمی ١٩٨١: ڕێبەری کوکۆلاکس کلانەکانی تێگزاز بەناوی لویس بیم (Louis Beam) کەمپێکی ڕاهێنانی شەڕی نیمچە سەربازیی لە ناوچەی دالاس بۆ لایەنگرانی بەرزێتی سپیپێستەکان دامەزراند.
- ٢١ ئادار ١٩٨١: رەشپێستێکی ١٩ ساڵان بەناوی مایکڵ دۆناڵد ( Michel Donald) بە دەستی ئەندامانی گروپی کلانەکانی ویلاتە یەکگرتووەکان ( United klans of America) لە مۆبایلی ئالاباما لە ڕێوڕەسمێکی تایبەتدا کوژرا.
- ٨ نیسان ١٩٨١: لویس بیم لە سەر ئەنجامدانی نمایشی نیمچە سەربازیی نایاسایی لە زەوییە فیدراڵییەکان تۆمەتبار و دادگایی کرا.
- ١٤ ئایاری ١٩٨١: ڕێگە لە جەنگاوەرانی کوکۆلاکس کلانی تێگزاز گیرا سەبارەت بەترساندنی ماسیگرە ڤیتنامییەکان.
- ٢٠ ئایاری ١٩٨١: ئەژدیهای ئیمپراتۆریەتی نادیاری کوکۆلاس کلانەکانی ئالاباما بەناوی بیلی ریچۆ (Riccio Billy) دوای ئەوەی لەکاتی هەڵگرتنی چەك لە کەمپی

داهێنانە میلیشاییەکانی ئەم گروپە لە کۆڵمێنی ئالاباما وێنەی گیرا بەهۆی پێشێل کردنی یاساکانی ئازادی بە مەرج کەوتە بەندیخانە.

- بەهاری ١٩٨١: ئەندامانی گروپی هێزی گەل لە چیاکانی سیرانێڤادای کالیفۆرنیا مانۆڕەکانی فێرکردنی سەربازی لەگەڵ کۆکۆلاکس کلانەکانبەرگوزرکردن. ئەم گروپە هەروەهادامەزرێنەری ڕاهێنانە میلیشیاکانی خێوەتگەی ویسکانسێن بوو و تێیدا ٢٠٠ پیاو ڕاهێنران.

- هاوینی ١٩٨١: پتر لە ١٠٠٠ کەس لە ٥٥ پۆلی ڕاهێنانی چەك و بیروباوەڕە سۆرڤیڤالیستییەکان کە لە ڤیستیڤاڵی ئازادی هاوینی کۆمەڵەی پارێزگاری لە نیشتمانپەرەستانی مەسیحی (Christian Patriots Pefence League) بەڕێوەچوو بەشدارییان کرد.

- ١٨حوزەیرانی ١٩٨١: تێری جەی چێدیستێر ( Terry J. Chidster)، ڕێبەری ئیمپراتۆریای نادیاری کوکۆلاکس کلانەکانی ئێنسلڤانیا بەکوشتنی پیاوێکی ڕەشپێستی ٦٨ ساڵان تۆمەتبار کرا.

- ٢٠حوزەیرانی ١٩٨١: ڕێبەری جەنگاوەری کوکۆلاکس کلان بەناوی دۆن بلەك (Don Black) بە تاوانی پیلانگێڕان بۆ ڕووخاندنی حکومەتی دۆمینیك مەحکوم کرا، حەوت کەسی دیکە دانیان بەم تاوانە دانا.

- ٢١ ئابی ١٩٨١: ڕێبەری نیونازییەکان بەناوی مایکڵ کەناڵی ( Mechael Canale) بە تاوانی سوتاندنی کڵێسایەك لە کالیفۆڕنیا بە ٤ ساڵ زیندان مەحکوم کرا.

- ١٦ ئەیلول: شەش کەس لە نیونازییەکان بەتاوانی پیلانگێڕی بۆ هاویشتنی بۆمبێکی ئاگردەر بەرەو چەند باڵەخانەیەك لە گرینز بۆرۆی کارۆلینای باکور مەحکوم کران.

- شوباتی ١٩٨٢: ئەندامانی کوکۆلاکس کلان کە دوای چۆڵ کردنی یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەم گروپە لە ناوئوتومبێلەکەیان و لە کاتی لێخوڕین تەقەیان لە پێنج پیرەژنی ڕەشپێست کردبوو، بڕی ٥٣٥ هەزار دۆلاریان وەك غەرامەدا.



- ئاداری ١٩٨٢: ٥ کەس لە ئەندامانی گروپی هێزی گەل دەستیان بە ڕاهێنانی تاکتیکی پارتیزانی بە (تیغی کوشتار) لە ڤێسکانی کانزاس کرد. لەم خولەدا بەشداربووان لە بواری کەڵك وەرگرتن لە تەقەمەنی، داونانەوەی دوای تەقینەوەیی، ژەهر، دەنگ بڕی و شەڕی دەستەویەخە ڕاهێنران.

- ئایاری ١٩٨٢: ٥ کەس لە ئەندامانی گروپی کوکۆلاکس کلان لە ئێسپرینگزی کۆلۆرادۆ لەگەڵ ٦ کەسی دیکە دوای فرۆشتنی ١٠ بۆمب بە یاساولێکی نهێنی دەستبەسەرکران. ئەم ڕووداوە بەشێك لە پیلانی بەرفراوانی هێزی ئاسایش جەماوەری بوو، فرۆشتنی بۆمب، تیرۆری دوو دادوەری فیدڕاڵ و تەقاندنەوەی نوسینگەی بەڕێوەبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەکانی دێڤێری کۆلۆڕادۆی دەگرتەخۆ.

- حوزەیرانی ١٩٨٢: پتر لە ٢٠٠ کەس کە نوێنەری ١٣ گروپی کۆکۆلاکس کلان و نیونازی بوون لە کۆنگرەی جیهانی نەتەوە ئارییەکان، کە لەلایەن ریچارد باتلێرەوە بەرگوزارکردبوو، بەشدارییان کرد.

- ئەیلولی ١٩٨٢: گروپی نەتەوە ئارییەکان و یەکیتی نەتەوەیی بۆ پێشکەوتنی سپیپێستەکان ( National Association the Advancement of White People) حەوت گروپی جیابۆوە لە کوکۆلاکس کلان لە ستۆن مۆنتێنی جۆرجیا کۆبوونەوە و دامەزراندنی کۆنفیدراسیۆنی کلانەکانیان ڕاگەیاند.

- کانوونی یەکەمی ١٩٨٢: ڕێبەری جەنگاوەری کۆکۆلاکس کلانی کارۆلینایا بەناوی گلین میلێر (Glenn Miller) لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە بنکەی ئاسمانیی مارێنز لە کارۆلینای باکور بەسترا لە پێشەوەی ١٥٠ کەس لە کۆکۆلاکس کلانەکان و نیونازییە پڕچەکەکان نمایشی سەربازی ئەنجامدا.

- ١٩٨٣: لوییز بیم پێشنیازی دانانی جۆرێك ((سیستەمی پلەدان))ی بۆ چالاکی ژێر زەمینی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەکان کرد و بەپێی ئەم سیستەمە لە بەرامبەر کوشتنی کاربەدەستە فیدراڵیەکان و ڕێبەرایەتی مافە شارستانییەکان پلە دەدرێ بە تیرۆریستان.

- ١٩٨٣: تۆم مێترگێر گروپی خۆڕاگری ئارییە سپیپێستەکان لە کالیفۆڕنیا دامەزرا.

- ١٩٨٣: ئەندامێکی کڵێسای کوێستانی بەناوی رۆبێرت میلز لە بەرهەمێکی چاپکراوی دا گروپە نەفرەتخوڵقێنەکانی هان دا واز لە چالاکیە ئاشکراکان بهێنن و ڕوو بکەنە تاکتیکە تیرۆریستییە ژێر زەمینی و نهێنیەکان. یەکێك لە جەنگاوەرانی کۆکۆلاکس کلان بەناوی تۆم رۆب ئەم پێشنیازەی قبوولّ کرد.

- ٤ کانوونی دووەمی ١٩٨٣: دوو سەد و پەنجا جوتیار لە ڕێوڕەسمی هەرزانفرۆشی مەزاری ئەندامێکی گروپی هێزی گەل کە لە چالاکی میلیشیایی بەشداری کردبوو لەگەڵ پۆلیس تووشی لێدان و پێکدادان بوون.

- ١٧ شوبات ١٩٨٣: ئەندامێکی گروپی هێزی گەل بەناوی گۆردون کاڵ ( Gordon Kahl) دوو مارشاڵی فیدراڵی لە داکۆتای باکور کوشت.

- ٢١ نیسانی ١٩٨٣: ڤیرجیل گریفین (Virgil Griffin) و ٥ ئەندامی دیکەی کۆکۆلاکس کلان لەگەڵ شەش نیونازی لە پێوەندی لەگەڵ ئەو شۆڕشەی لە گرینزبۆرۆی کارۆلینای باکور هەڵگیرسابوو و ٥ کەس لە دژایەتکەرانی کۆکۆلاکس کلانەکان تێیدا کوژرابوون لەلایەن دەوڵەتی فیدڕاڵەوە مەحکوم کران.

- ئایاری ١٩٨٣: وەك بەشێك لە پرۆگرامی ترسنانەوە کە جەنگاوەرانی کۆکۆلاکس کلان پێڕەوی گلین میلێر لە کارۆلینا سازیان دابوو خاچێك لە حەساری ماڵی پاسەوانێکی بەندیخانەی (ڕەشپێست بوو) کارۆلینا باکور سوتێندران.

- ٣ حوزەیرانی ١٩٨٣: ئەندامێکی گروپی هێزی گەل بەناوی گۆردون کاڵ دوای تیرۆری بەڕێوەبەری پۆلیسی ئارکانزاس بەگوللە کوژرا.

- ٢٨ تەمووزی ١٩٨٣: نوسینگەکانی چاودێری لە کلانەکانی سەر بە ناوەندی یاسای هەژاری لە باشور سوتێندران و کاولّکران، سیٚ کەس لە ئەندامانی شەڕکەری کۆکۆلاکس کلان لەم ئاگرتێبەردانە دەستبەسەرکران.

- ئەیلولی ١٩٨٣: دامەزراندنی تاقمی فەرمان.



- ٣ تشرینی دووەمی ١٩٨٣: برۆس پێیەرس (bruce pierce) بە تۆمەتی هەڵگرتنی پارەی ساختە لە یۆنیۆنی گۆپی ویلایەتی واشینگتۆن دەستبەسەرکرا.

- ٣ تشرینی دووەمی ١٩٨٣: تۆم مێتز ئەندامی گروپی خۆڕاگریی ئارییەکان و سپیپێستەکان و ریچارد باتلێر ئەندامی گروپی نەتەوە ئارییەکان بەتاوانی ئاگرتێبەردانی نایاساییانەی خاچ لە دۆڵی سان فێرناندۆی کالیفۆڕنیا دەستبەسەرکران.

- ١٦ ئاداری ١٩٨٤: ئەندامانی تاقمی فەرمان لە سیاتێل ٤٣٣٤٥ دۆلاریان لە بارهەڵگرێکی گوللەبەند رفاند.

- بەهاری ١٩٨٤: لویس بیم تۆڕێکی کۆمپیوتەری بۆ گروپی نەتەوە ئارییەکان دامەزراند.

- ١٧ ئایاری ١٩٨٤: نۆ کەس لە ئەندامانی ئیمپراتۆریای نادیاری کوکۆلاکس کلانی ئالاّباما بەهۆی پەلاماردانی خۆپیشاندانی لایەنگرانی پارێزگاری لە مافە شارستانییەکان لە دیکتاتۆری ئالاّباما بە پێشێل کردنی مافە شارستانییەکان تاوانبارکران.

- ١٨حوزەیرانی ١٩٨٤: میوانی پرۆگرامی تەلەڤزیۆنیی وتووێژ بەناوی ئالێن بێرگ (Alaln Berg) لەلایەن ئەندامانی تاقمی فەرمان لە دێنڤیر تیرۆرکرا. ناوی بێرگ لە لیستێکی ڕەش لە تەنیشت ناوی دەیان کەسی دیکەی مەحکوم بەمەرگ هاتبوو.

- حوزەیران ١٩٨٤: ئەندامێکی گروپی پەیمان، شیرو بازووی خودا بەناوی ریچارد سنێل (Richard Snell) یەکێك لە سەربازەکانی ویلایەتی ئارکانزاس بەناوی لویس بریانت (Louis Bryant) کوشت.

- ١٩ تەمووزی ١٩٨٤: ئەندامانی تاقمی فەرمان بڕی ٣,٨ ملیۆن دۆلاریان لە ئوتومبیلێکی بارهەڵگری گوللەبەند بۆگواستنەوەی پارەوپول لە ئۆکیاهی ویلایەتی کالیفۆڕنیا ڕفاند. ئەم پارەیە لە نێوان گروپە لایەنگرەکانی بەرزێتی سپیپێستانی سەرانسەری دەوڵەت بۆ وێنە گلێن میلێر لە کارۆلینای باکور، تۆم میتزگێر لە کالیفۆڕنیا و ویلیام پییەرس لە ڤێرجینیای ڕۆژئاوا دابەش کرا.

- ٩ تشرینی دووەمی ١٩٨٤: سێ ئەندامی ئیمپراتۆریای نادیاری کوکۆلاکس کلانی جۆرجیا لە پێوەندی لەگەڵ ئەنجامدانی چەندین هێرشی نەژادپەرستانە بە پێشێلکردنی مافە مەدەنییەکان تۆمەتبار و مەحکوم کران.

- ٢٧ تشرینی دووەمی ١٩٨٤: کوکۆلاکس کلانەکانی ئالاباما بەپێی حوکمی دادگای فێدراڵ ڕێگەیان لێگیرا بەردەوامی بە ڕاهێنانە میلیشیاییەکانیان بدەن لە خێوەتگای مای لی کۆڵمەنی ئالاباما.

- ٨ کانوونی یەکەم ١٩٨٤: دامەزرێنەری تاقمی فەرمان بەناوی ڕۆبێرت میتیۆز لە شەڕ و پێکدادانێك لەگەڵ یاساوڵەکانی نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی لە ڤیدبی ئایلەندی واشینگتۆن کوژرا.

- ١٧ کانوونی دووەمی ١٩٨٥: بەپێی حوکمی دادگای فیدراڵ، گلێن میلێر، پارتی نیشتمانپەرستە سپییەکان، جەنگاوەرانی کوکۆلاکس کلانی کارۆلینا و جەنگاوەرانی هاوپەیمانی کوکۆلاکس کلان ناچارکران واز لە ڕاهێنانە میلسشیاییەکان لە کارۆلینای باکور و ترساندنی هاوڵاتیە ڕەشپێستەکانی ئەو ویلایەتە بهێنن.

- شوباتی ١٩٨٥: ئەندامێکی ئەوی گروپی نەتەوە ئارییەکان و لایەنگرانی کۆکۆلاکس کلان بەناوی بیلی ریچۆ بەتۆمەتی هەڵگرتنی چەکی نایاسایی دەستبەسەرکرا. پۆلیس لە ڕەوتی گیرانەکیدا پێرستێکی ڕەشی ئامانجەکانی داهاتووی دۆزییەوە.

- ٩ نیسانی ١٩٨٥: ٥ ئەندامی کوکۆلاکس کلانە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەتاوانی پیلانگێڕی بۆ تەقاندنەوەی سامانی ڕەشپێست و یەهودییەکان دەستبەسەرکران.

- ١٢ نیسانی ١٩٨٥: بیست و سێ ئەندامی تاقمی فەرمان بەتۆمەتی دزی، ساختەکاری، دانانەوەی بۆمب، ئاگردان، هەڵگرتنی چەکی نایاسایی و کوشتن بەپێی پێڕەوی دیکۆ مەحکوم کران.



- ١٥ نیسانی ١٩٨٥: ئەندامێکی تاقمی فەرمان بەناوی دیڤید تەیت ( David Tate) سەربازێکی ویلایەتی مەیسوری بەناوی جیمی لینگار (Jimmie Linegra) بەگوللە کوشت. تەیت لە ٢٠ی نیسان دەستبەسەرکرا.

- ١٩ نیسانی ١٩٨٥: یاساوڵە فیدراڵییەکان لەگەڵ پۆلیسی ئارکانزاس هێرشیان کردە سەر شوێنی کۆبوونەوەی سۆرڤیڤالیستەکانی سەر بەگروپی پەیمان، شیرو بازووی خودا و ڕێبەری ئەم گروپەیان بەناوی جیمز ئێلیسۆن (James Ellison) لەگەڵ چوار ئەندامی دیکە دەستبەسەرکران. لەم هێرشەدا دەستبەسەر چەکی نایاسایی، مینی زەمینی، تەقەمەنی، ژەهری سیانورر، مووشەك هاوێژێك و ماشێنێکی دژە فیشەکدا گیرا. ئێلیسۆن لەگەڵ شەش ئەندامی دیکەی گروپی ناوبراو بەتاوانی پێشێلکردنی یاساکانی هەڵگرتنی چەك و تێگرتنی مووشەك مەحکوم کرا.

- ٧ حوزەیرانی ١٩٨٥: شەش کەس لە گروپی کۆکۆلاکس کلان و نیونازییەکان لەگەڵ دوو یاساوڵی پۆلیسی شاری گرینز بۆرۆی ویلایەتی کارۆلینای باکور بەتاوانی هێرش و تەقە لە خۆپیشاندانەکانی نەیارانی گروپی کۆکۆلاکس کلان مەحکوم کران.

- ٢٤ حوزەیرانی ١٩٨٥: ئەفسەرانی بەڕێوەبەری یاسا هێرشیان کردە سەر شوێنی کۆبوونەوەکانی گروپی هێزی گەلی سەر بە جیمز ویکسترۆم (James Weackstrom) لە ناوچە گوندییەکانی ویسکانسێن و بلاوەیان پێکردن.

- حوزەیرانی ١٩٨٥: نۆ ئەندامی پارتی نیشتیمانپەرستە سپیپێستەکان لەسەر تاوانی هێرشی نەژادپەرستانە و تێکدانی سامانی گشتی لە بێڵ گلیدی ویلایەتی فلۆریدا دەستبەسەرکران.

- ٣٠ حوزەیرانی ١٩٨٥: لێکۆڵینەوە ناوخۆییەکان یەکەیەکی کۆکۆلاکس کلانی لەناو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ویل کۆنتاکی بەناوی دەستەی گەشتی ئەفسەرە یەکگرتووەکان (Confederate Officers Patrol Sqaud) دۆزیەوە.

- ١٧ ئابی ١٩٨٥: لە هێرشێكدا بۆ سەر شوێنی كۆبوونەوەكانی سۆرڤیڤالیستەكانی بزاڤی شوناسی مەسیحی كە بە ڕێبەری مایكڵ ریان (Michael Ryan) پێكهێنرابوو تەرمی منداڵێكی ٥ ساڵە و پیاوێكی ٢٦ساڵە دۆزرایەوە.

- ٢٣ ئەیلول ١٩٨٥: نۆ ئەندامی جەنگاوەرانی سپیپێستی ئازادی ( White Knights of Liberty) (لە كوكۆلاكس كلان جیابۆوە) بەتاوانی ترساندنی ڕەشپێستەكانی ویلایەتی كارۆلینای باكور دەستبەسەركران.

- تشرینی یەكەم ١٩٨٥: نوسینگەی لێكۆڵینەوەی فیدراڵی (ئێف بی ئای) لە ڕاپۆرتێكدا لە بەردەم كۆنگرەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ڕایگەیاند ١٦ كەمپی ڕاهێنانی میلیشیاییان لە سەرانسەری وڵات دۆزیوەتەوە كە زۆربەیان لە باشور و ڕۆژئاوای ئەمریكا دامەزرابوون.

- تشرینی دووەمی ١٩٨٥: سەرۆكی بزوتنەوەی شوناسی مەسیحی لاری هامفریر(Larry Humphreys) لە پێشەوەی گروپێكی پڕچەك لە لایەنگرەكانی بەرەو كێڵگەی جۆرجیا وەڕێكەوت بۆئەوەی پێش بەزەوتكردنی ئەم كێڵگەیە بەهۆی قەرزدارییەوە بگرێت.

- ١٧ كانوونی دووەم ١٩٨٦: دوازدە كەس لە جەنگاوەرانی سپیپێستەكانی ئازادی بە تاوانی دەستدرێژی، سووتاندنی خاچ و تۆقاندنی ڕەشپێستەكان و چەند پێوەندێكی هاوسەرێتی لە نێوان هەردوو نەژاد مەحكوم كران.

- نیسانی ١٩٨٦: جەنگاوەرانی دەیل رێوش (Dale Reusch)، ئەژدیهای مەزنی كوكۆلاكس كلانی ئۆهایۆ بە تاوانی گواستنەوەی چەك بەشێوەیەكی نایاسایی مەحكوم كران.

- ٢٥ حوزەیرانی ١٩٨٦: گلێن میڵر(Glenn Miller) و ستێفن میلێر (Stephen Miller) و پارتە نیشتمانپەرستە سپیپێستەكەیان بەهۆی پێشێلكردنی



بڕیاری قەدغەكردنی ڕاهێنانە میلیشیاییەكان لە كارۆلینای باكور بە تاوانی سووكایەتی بە بڕیاری دادگا مەحكوم كران.

- ٨ ئابی ١٩٨٦: سەرۆكی پێشووی یەكێتی خوێندكارانی سپیپێست ( White Student Union) و گرێك ویسرۆ (Withrow Greg) دوای مەحكوم كردنی نەژادپەرستی و ئاشكراكردنی پێوەندیەكانی ئەم ڕێكخراوە لەگەڵ تیرۆریستانی لایەنگری بەرزێتی سپیپێستەكان كەوتە بەر پەلاماری چەند كەسێك و دەستەكانیان بە بزمار لەدار داكوتا.

- ١٩-١٥ ئەیلولی ١٩٨٦: باڵەخانەی پۆلیسی فیدڕاڵ و ماڵی قەشەیەك و دوو دامەزراوەی بازرگانی ناوچەیی لە بەشی كوتنای ئایداهۆ لەلایەن ئەندامانی گروپی نەتەوە ئارییەكان بە بۆمب تەقێندراوە.

- ٢٧ ئەیلولی ١٩٨٦: سێ ئەندامی پێشووی پارتی نیشتمانپەرستە سپیپێستەكان وەكو ستێڤان میلڕ و جاك جاكسۆن (Jack Jackson) بە تاوانی پیلانگێڕی بۆ بڕینی ڕیستۆرانتێك، كڕینی ئەو تەقەمەنیانەی لە سوپا دزراوە و تەقاندنەوەی ناوەندی یاسای هەژاری لە باشور مەحكوم كران.

- ٢٣ تشرینی یەكەم ١٩٨٦: ویلیام پۆتێر گەیل (William Potter Gale) و حەوت ئەندامی كۆمیتەی ویلایەتەكانی گروپە پێشڕەوەكانی هێزی گەل لە كاتی دارِشتنی پیلان بۆ دادوەرێكی فێدڕاڵ و كاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی داهاتە ناوخۆییەكان دەستبەسەركران.

- ١٥ تشرینی دووەم ١٩٨٦: شەش ئەندامی نیشتمانپەرستانی ئەریزۆنا بە تاوانی هەوڵدان بۆ دزی و دانانەوەی بۆمب دەستبەسەركران.

- تشرینی دووەم ١٩٨٦: ئەندامێكی بزاڤی نیونازی بەناوی كارڵ هاند بە تاوانی هەوڵدان بۆ مرۆڤكوژی لە لویزیانا مەحكوم كرا.

- ٨ کانوونی دووەمی ١٩٨٧: پێنج ئەندامی پارتی نیشتمانپەرستە سپیپێستەکان لەلایەن بەرپرسە فدراڵییەکانەوە بە تۆمەتی پیلانگێڕی بۆ دزینی چەکەکانی سوپا لە فۆرت براگی کارۆلینای باکور مەحکوم کران.

- ١٧ کانوونی دووەمی ١٩٨٧: لە ڕەوتی دەستدرێژی و ئاگرتێبەردانی کتێب فرۆشیەك لە شلبی کە دەکەوێتە سەر کارۆلینای باکور سێ پیاو کوژران و دوو کەسی دیکەش برینداربوون. سێ ئەندامی پارتی نیشتمانپەرستە سپیپێستەکان بە تۆمەتی ئەنجامدانی ئەم هێرشە مەحکوم کران.

- ١٣ شوباتی ١٩٨٧: بەپێی بڕیاری دەستەی سوێندخۆرانی دادگایەك لە مۆبایلی ئالاباما، گروپی کلاّنە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرپرسیاری تیرۆرکردنی مایکڵ دۆناڵد (Mochael Donald) ناسراوو بەپێدانی ٧ ملیۆن دۆلار وەك قەرەبووی زیانەکانی بە دایکی کوژراو مەحکوم کرا.

- ٢٤ نیسانی ١٩٨٧: دە لایەنگری بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکان بۆ وێنە ریچارد باتلێر لویس بیم و رۆبێرت مێڵز بە تاوانی دارِشتنی پیلان بۆ نانەوەی دووبەرەکی لە فۆرس سمیتی ئارکانزاس مەحکوم کران.

- ٣٠ نیسانی ١٩٨٧: گلێن میلێر و سێ کەس لە لایەنگرانی لە مەیسووری بە تاوانی داڵدەدانی دوورخراوەکان مەحکوم کران.

- حوزەیرانی ١٩٨٧: ڕێبەری لاوانی لایەنگری گروپە خۆڕاگریی ئارياييە سپیپێستەکان بە ناوی دەیڤید مازێلا(David Mazzela) ستایشی کەللەپێستەکانی کرد بەهۆی هێرش بردنە سەر پیرێژنێکی ڕەشپێست لەسەر پردێك لە سین خۆزەی کالیفۆڕنیا.

- ٦ تشرینی دووەمی ١٩٨٧: نوێنەری دەسەڵاتداری ڕەهای گروپی نەتەوە ئارییەکان بە ناوی لوییز بیم جوای ئەوەی ناوی کەوتە نێو لیستە دە کەسیەکەی ئێف بی ئای کە لە مەکسیك لە ژێر ڕاوەدوونان بوون، دەستبەسەرکرا.



- ٩ تشرینی دووەمی ١٩٨٧: کەللەپێستییەکانی ناوچەی شیکاگۆ لە چل و نۆیەمین ساڵوەگەڕی هێرشی هیتلەر بۆ سەر یەهوودییەکان لە ئەڵمانیاچەند شوێنێکی کار و کاسبی و ژمارەیەك کڵێسایان لە شیکاگۆ وێران کرد.

- ٢٠ کانوونی یەکەمی ١٩٨٧: پیاوێکی ڕەشپێست لە دەرەوەی مۆزەخانەی هونەری تامپا (Tampa Museum Of Art) لە فلۆریدا کەوتە بەر پەلاماری کەللەپێستییەکان و کوژرا.

- ٢٥ کانوونی دووەمی ١٩٨٨: پێشەوای ئاینی بزاڤی شوناسی مەسیحی بەناوی جەیمز ویکسترۆم (James Weackstrom) و ڕێبەری گروپی هێزی گەل بە تاوانی ساختەکاری مەحکوم کرا. ویکسترۆم و هاودەستەکانی دەیانویست بەکڕینی چەکی دزراو، کەمپێکی ڕاهێنانی نیمچە سەربازی بۆ لایەنگرانی بزاڤی بەرزێتی سپیپێستەکان لە پێسلڤانیا دروست بکەن.

- ١٣ تشرینی دووەمی ١٩٨٨: پیاوێکی ئەسیۆپیایی بەناوی مۆڵگریتا سێراو (Mulgreta Seraw) لە پۆرتلەندی ئەرەگۆن کەوتە بەر پەلامار و کوژرا.

- ١٠ کانوونی یەکەمی ١٩٨٨: کەللەپێستییەکانی ڕینۆ لە ویلایەتی نیڤادا پیاوێکی ڕەشپێستیان کوشت.

- ١٤ کانوونی دووەم ١٩٨٩: نزیکەی ٤٠٠ کەس لە کەللەپێستەکان و کوکۆلاکس کلاّنەکان لە پولاسیکی ویلایەتی تێنسی نمایشی سەربازییان ئەنجام دا.

- ١٩ ئایاری ١٩٨٩: ئەندامێکی کۆکۆلاکس کلاّنەکان بەناوی فڕانك کۆکس ( Frank Cox) بە تاوانی کوشتنی مایکڵ دۆناڵد (Michael Donald) لە مۆبایلی ئالاباما مەحکوم کرا.

- ئەیلولی ١٩٨٩: شەش سەد کەس لە کوکۆلاکس کلاّن و کەللەپێستیەکان لە ستۆن مۆشینی ویلایەتی جۆرجیا کۆبوونەوە.

- **٣٠ ئەیلولی ١٩٨٩: ١٦** کەس لە کەللەپێستیەکان لەلایەن وەزارەتی دادەوە بە تۆمەتی پێشێلکردنی مافە شارستانییەکان و شکاندنی یاساکانی هەڵگرتنی چەك مەحکوم کران.
- **٢٣ تشرینی یەکەمی ١٩٨٩:** چوار ئەندامی گروپی هێزی گەل بە تاوانی بەکارهێنانی ٣ ملیۆن دۆلاری ساختە لە مامەڵەی موڵك و ماڵ و زەویوزار لە کارۆلینای باکور دەستبەسەرکران.



## چی فێربووین ؟

کۆنترۆڵکردنی تیرۆریزم بەهۆی نەناسرانی ماهییەت و هەروەها نەبوونی هاوڕایی لەسەر ئەو سەرچاوانەی دەبێ کۆبکرێنەوە بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵی، زۆر دژوارە. لەوانەیە هێرشەکانی دەوڵەت بۆ قەرەبووکردنەوەی کردەوەکانی گروپە تیرۆریستیەکان کۆمەڵێك کێشە و گرفتی لێ بکەوێتەوە. ئەم جۆرە هێرشانە بەزۆری ئاسەوارێکی نێگەتیڤی لێ دەکەوێتەوە و دەبێتە هۆی زۆربوونی چالاکییەکانی تیرۆریستان. لەلایەکی دیکەوە سیاسەتی خەمساردی لە بەرامبەر چالاکی تیرۆریستانیش دەتوانێ مانای ڕێخۆشکەری بۆ چالاکییەکانیان لەو پەڕی بێ ترسییەوە بدات. لە داهاتوودا دەبێ هەوڵی ئەوە بدرێ نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵوێستی توند و مکوڕتر لە بەرامبەر هێرشەکانی تیرۆریستان وەربگرێت. بەو پێیە دەبێ بۆ پەرەپێدانی هاوکاری لە نێوان هەموو دەوڵەتانی جیهان و بە ئامانجی یەکگرتنیان لە بەرامبەر چالاکییە تیرۆریستییەکان و یەکخستنی دەزگاکانی پۆلیس و، سەربازی و هەواڵگرییەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستە هەوڵ بدرێت.

## پەراوێزەکان

1. Friedlander, 1982.

مشخصات این منبع در کتاب شناسی نیامده بود. – م

2. Daniel Gorges – Abeyie, ((Women as Terrorists)). In perspectives in Terrorism, Wilmington, DE: Scholarly Resources, 1983.
3. National Irstitute of Justice, Update: State and Local Responses to Terrorism, Washington, DC: U.S. Department of Justice, June 1995.
4. M.Cooper, ((Combathng Terrorism,)) Congressional Quarterly, Jully 1995, 21:1.
5. J.R. White, Terrorism: An Introduction, Pacific CA: Brooks/ Cole, 1991.
6. Ibid.
7. P. Wilknson, Political Terrorism, New York: Wiley, 1974.
8. J.B. Bell and T.R Gurr, ((Terrorism and Revolution in America)) in H.D. Gram and T.R. Gurr, eds., Violence in America. Newbury Park, CA: sage, 1979.
9. White, op. cit.
10. Ibid.
11. Ibid.
12. W. Laqueur, ((Postmodern Terrorism)), Foreign Affairs, Septmber/ October, 1997, pp. 24-36.
13. P. Wiseman, ((Missiles Hit Sudan, Afghanistan: Chemical Plant Terrorist Camp Were Targeted)), USA Today, August 21, 1998, p.3a.



14. L.M. Katz, ((U.S. Offers $5M for Bin Laden)) USA Today, November 5, 1998, p. 1a.
15. White, op. cit.
16. Michaet D.Lyman and Gary W. Pooter, Organized Crime, N.J.: Prentice Hall, 2000, Chs. 1-7.
17. J. Smolowe, ((His Turn to Lose)), Time, September 11 1992, pp. 47-48.
18. W.J. Chambliss, on the Take: From Petty Crooks to Presdents, 2nd ed., Bloomington, IN: Indiana University Press, 1988, p.327.
19. W.J.Chambliss,State-Organized Crime, Paper Presented af the Anuual Meeting of the American Society of Criminology, November, 1986.
20. Ibid.
21. Ibid.
22. J. Prados, President,s Secret Wars, New York: William Morrow, 1986; D.R Simon and Eitzen, Elite Deviance, Boston: Allyn and Bacon, 1986; P,Beirne and J.Messerschmidt, Criminology, New York: Harcourt Brace Jovanorich, 1991, PP. 258 – 259.
23. Simon and Eitzen, op. cit., P. 158.
24. Berine and Messershmidt, op. cit., P. 258.
25. E. Herman, The Real Terror Network, Boston: South End Press, 1982, P. 176; Beirne and Messerschmidt, op. cit ., 259.
26. H. Kruger, The Great Heroin Coup, Boston: south End Press, 1980; W. Hinckle and W. Turner, the Fish Is Red: The Story of the Secret War against Castro, New York:

Harper & Row, 1981; Berine and Messerschmidt, op . cit., PP. 259-261.
27. Herman, op. cit.
28. Simon and Eitzen, op. cit., Beirna and Messerschmidt, op. cit., P. 263.
29. Herman, op. cit.
30. Simon and Eitzen, op. cit., P. 81.
31. H. Messick and B. Goldblatt, The Only Game in Town, New York: Tomas Y.Crowel, 1976.
32. F. Pearce, Crimes of the Powerful: Marxism, Crime and Deviance, London: Pluto Press, 1976, op. 149; Simon and Eitzen, op.cit., P. 81.
33. Pearce, op. cit., P. 150.
34. A. Mc Coy, the Politics of Heroin in Southeast Asia New York: Harper & Row, 1972; J. Kwitny, The Crimes of Patriots: A True Tale of Dope, Dirty Money, and The CIA, New York: Norton, 1987.
35. J. Mills, The Underground Empire, New York: Doubleday, 1986.
36. Kwitny, op. cit., P. 51.
37. P. Lernoux, In Banks We Trust, Garden City, NY: Anchor Press, 1984.
38. Kwinty, op. cit., New York Times March 8 , 1987.
39. Kwinty, op. cit.,P. 79.
40. V.Kappleler, M. Blumberg and G Potter, The Mythology of Crime and Criminal Justice, Prospest Heights, IL: Waveland Press, 1993, PP. 237-238.
41. New York Times, January 1, 1975.



42. Chambliss, Stat-Organized Crime, op. cit.
43. Newsday, June 28, 1987.
44. L. Cockburn, out of Control, New York: Atlantic Monthly Press, 1987, P. 155.
45. Ibid.
46. J. Kerry, Interim Report, Subcommittee on Narcotics, Terrorism and International Operations, United Senate, Washington, DC: U.S. Government Printing Office, 1986, P. 10.
47. Boston Globe, July 20, 1986.
48. CBS News, West 57 th, April 6, 1987.
49. Ibid.
50. Cockburn, op. cit., p. 17.
51. Newsday, April 6, 1986; Cockburn, op. cit., p. 183.
52. Cockburn, op. cit., p. 157.
53. Ibid., PP. 160-161.
54. Keery, op. cit., P. 10; San Francisco Examiner, March 16, 1989 and June 23, 1986.
55. San Francisco Examiner June 23, 1986.
56. CBS News, West 57 th, June 12, 1986. 140. San Jose.
57. Tico Times, May 31, 1985.
58. Bell and Gurr, op. cit.
59. Ibid.
60. Lyman and Potter, op. cit., ch. 4.
61. B.Frankel, <<Radical Islam, West Face Off Again in NYC>>, USA Today, January 9, 1995, p. 2A.

62. F.D. Homer, <<Terror in the United States: Three Perspectives>> in M. Stohl, ed ., The Politics of Terrorism, New York: Marcel Dekker, 1983, pp. 145-177.
63. M.M.Trick, Chronology of Incidents, Quasi-terrorstic, and Political Violence in the United States, National Advisory Committee. on Criminal Jusyice Standards and Goals, Washington, DC: U.S. Government Printing Office, March 1976.
64. Ibid.
65. J.W. Harris, “Domestic Terrorism in the United States in 1985” in P. Wilkenson and A.M. Stewart, eds., Contemporary R esearch on Terrorism, Aberdeen, Scotland: Aberdeen University Press, 1987, pp. 230-240.
66. H.J. Vetter and G.R. Pearlstein, Perspectives on Terrorism, Pacific Grove, CA: Brooks/ Cole, 1991.
67. J. Jacobs, “Stratification and Conflict Among Prison Inmates” , Journal of Criminal Law and Criminology, Vol. 66 (1976), p. 467.
68. Vetter and Pearlstein, op. cit.
69. G. Fields and B. Twigg, “More Church Fires set; Girl Arrested” , USA Today, June 11, 1996, p. 1A.
70. Vetter and Pearlstein, op. cit.
ای برگرفته از منابع ژیل است. ۷۱. مگالب این بخش خلاصه
Anti – Defamation Leage of B,nai B,rith, Extremism on the Right: A Handbook, New York: B,nai B,rith, 1988, and Hate Groups in America: A Record of Bigotry and Violence, New York: B,nai B,rith, 1988; and Southern Poverty Law Center, 1989.



72. T. Halpern, D. Rosenberg, and I.Suall, “Milita Movement: Prescriotion for Disaster” , USA Today Magazine, January 1996, pp. 17-22.
73. K.S. Stern, “Milita Mania” , USA Today Magazine, January 1996, pp. 13-14.
74. Marc Cooper, “Montana,s Mother of All Militias” , The Nation, May 22, 1995.
75. Ibid.
76. D. Helvarg, “The Ani- Enviro Connection” The Nation, May 22, 1995 P. 722.
77. Ibid.
78. R. Holden, Postmillennialism as a Justification for Right – Wing Violence, Gaithersburg, MD: International Association of Chiefs of Police, 1986.
79. A.P. Schmid and J . de Graaf, Violence as Communication: Insurgent Terrorism and the Western News Media, Beverly Hills, CA: Sage, 1982.
80. B. Hoffman, "Terrorism in the United States in 1985" in P. Wilkenson, and A.M. Stewart, eds., Contemporary Research on terrorism, Aberdeen , Scotland: Aberdeen University press, 1987, p.230.
81. T.Mauro, "Free Speeach Dispute Bubbles Beneath Violence" , USA Today, January 10, 1995, p.2A.
82. Ellen Goodman, "Pro-life Fanaics Have Taken Their Rhetoric over the Edge" Boston Globe, Junuary 4, 1995, p. 6B.
83. Ibid.

84. S.Baldauf, "Killings Spur Move to Stem Abortion Clinic Violence", The Christian Science Monitor. Desember 30, 1994.
85. d. Howlett, "Incidents, Reports Spark FBI Probe" USA Today, January 10, 1995, p. 1A.
86. Ibid.
87. L.Siegel, Criminology, St. Paul, MN: West Publishing Co, 1992.

* Presidents task force on combating terrorism,
A Public report, Washington, DC, US Government Printing office, February 1,1986
** J. smolowe , the myth of Guzman, Time , September 28, 1992 , p.48.
*** J.R. White, Terroeism: An Introduction, Pacific Grove, CA: Brooks/cde

تێبینی: ئەم بابەتە لە (Michael D.Lyman and Garry W. Potter, "Terroism as Organized Crime" In Organized crime, N.J; Prentice Hall,200. Chapter 8) لەلایەن هەردوو وەرگێڕەوە (دکتۆر سەید قاسمی زەمانی و عەلی رەزا تەیب) بۆ سەر زمانی فارسی وەرگێڕدراوە.